# ڤمینیزم
## فیكرو ڕەوتەكانی



نورة فرج المساعد
وەرگێڕانی: عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی
سلێمانی هاوینی ٢٠٠٦





**سەرپەرشتیاری پرۆژە: جەبار سابیر**

**فێمینیزم**

- وەرگێڕانی: عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی
- بابەت: لێكۆڵینەوە
- تایپ: هێمن ئیبراهیم
- نەخشەسازیو بەر (ناوەندی دیزاینی یانەی قەڵەم)
- چاپ: یەكەم ٢٠٠٦
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- سەرپەرشتیاری هونەری: ئارام سدیق
- سەرپەرشتیاری چاپ: ئاسۆ پێنجوێنی
- چاپخانە: (یاد) بازاڕی سۆز
- ژمارەی سپاردنی(٥٢٨) وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

**لەچاپكراوەكانی پرۆژەی كتێبی یانەی قەڵەم**
**زنجیرە(٩)**

## فێمینیزم

هەندێك كەس كوێرانە سەیری فێمینیزم دەكەن بۆ ئەوە دەچن كە زۆر دوورە لەوەی پێی بوترێت تیۆر" بەلای ئەوانەوە تەنها تێكەڵێكی كوێرانەیە لە كۆمەڵێك رەخنەی تیۆری، قورسییەكی تووش دەبێت لە خستنەوەی شیكردنەوەیەكی تیۆریانە بۆ بە نزمزانینی ئافرەت. بەپێچەوانەی ئەمەوە هەندێك وا دەبینن فێمینیزم هەر تەنها تاكە تیۆرێك نییە، بەڵكو كۆمەڵێك تیۆر و رەوتە" هەریەكەیان بۆچوونێك دەگری بۆ كێشەی چەوساندنەوەی ئافرەت، هۆو ئەنجامەكانی شیدەكاتەوە، ستراتیج بۆ رزگاربوونی دادەنێت.

هەرچەندە یەك پێناسە یا چەمك بۆ فێمینیزم نییە، بەڵام دەكرێ بوترێت بریتییە لە كۆمەڵێك بیروبۆچوونی بەیەكەوە گرێدراوی بزووتنەوەیەكی كۆمەڵایەتی، یا هەڵوێستێكی كۆمەڵایەتی كە گۆڕین مەبەستێتی. بەگشتی مانایەكی فراوانە، جەخت لەسەر داواكردنی مافی سیاسی و یاسایی و مافی سەربەخۆیی و سەربەستی سێكسی، یەكسانی لە رەخساندنی





هەل و مافی بڕیاردانی چارەنووس (مافی لە باربردن و بەكارهێنانی شێوازی رێگرتن لە منداڵبوون) دەكات ، ئەمانە هەموو لە ئەنجامی باوەڕكردن بە ئاستی نزمی ئافرەت دروستبوو، و لە ئەنجامی جیاوازی و نەبوونی یەكسانییەوە هاتە كایەوە. هیچ رۆژێك لە رۆژان فێمینیزم بزوتنەوەیەكی یەكگرتوو نەبووە، بەڵام لە چەند رەوتێكی جیاواز پێكهاتووە. جیاوازی ئاشكرای نێو ئەم قوتابخانەیە لە دوو باردا خۆی دەبینێتەوە یەكەمیان پەیوەستە بە پشتگیریكردن لە مافی ئافرەت كەلەسەر لێچوون بەرزبۆتەوە، و جەخت لەسەر ئەوە دەكات كە ئافرەت بەتەواوی وەكو پیاو ئینسانە، لەبەر ئەوە دەبێت هەمان مافی پێ بدرێت، رەوتێكی تریش لەسەر جیاوازی هەڵچووە و دەڵێ ئافرەت جیایە لە پیاو، لەبەر ئەوە دەبێت ئافرەتان مافیان لەرێگای نوێنەرایەتی و پێشكەشكردنی تواناكانیانەوە پێبدرێت.

گەڕان بەدوای سەرەتاكانی بزوتنەوەی ئافرەتاندا كارێكی ئاسایی نییە، نایشتوانین بیگەڕێننەوە بۆ زەمەنێكی دیاریكراو، بەڵام دەكرێ بوترێت تەنانەت لە چاخەكانی ناوەڕاستدا كەسانێك هەبوون لەگەڵ سروشتی ئافرەت و مافەكانیا بوون، بەڵام بە شێوەیەكی مێژوویی سەلمێنراو ماوەی نێوان (١٧٩٠-١٨٩٠) سەرەتاكانی بزوتنەوەی فێمینیزمی بە خۆیەوە بینیوە، چونكە ئەم ماوەیە بە بیروبۆچوون و فیكری رۆشنبیری ناسراوە و دەستنیشانكراوە (Enlghtenment) وەك مافی مرۆڤ،

پشتبەستن بەیاسای سروشتی، جگە لەمە هەردوو شۆڕشی فەرەنسی و ئەمریکی کێشەگەلێکیان وروژاند کە پەیوەندییان بەمافی ئافرەتەوە هەبووە.

ساڵی (١٧٩٢) ماری وولستونکرات (Marywollstonecratt) بەڵگەنامەیەکی ئافرەتانەی لە ژێر ناونیشانی (داکۆکیکردن لە مافی ئافرەت) (Avindiation of the lpihts of women) نووسی.

بزوتنەوەی ئافرەتانیش داوای ئەوەی دەکرد مافی دەنگدان بە ئافرەتان بدرێت، ئەو بزوتنەوە لە نێوان (١٨٦٠-١٩٣٠)دا سەریهەڵدا و گەشەیسەند ڕۆڵی چاکی هەبوو لە یەکخستنی ئافرەتان بە هەموو جیاوازی باکگراوندی چینایەتی و رەگەزی و رۆشنبیریانەوە لە خیلالی ئەم بزوتنەوەوە ئافرەتان دەرکیانکرد کە ناکرێت پشت بە حزبی رامیاری و یەکێتی کرێکاری بەمەبەستی پشتگیریان ببەسترێت پێویستە خۆیان خەباتبکەن بجەنگن بۆ بەدیهێنانی یەکسانی و دادپەروەری.

هەروەها لێکۆڵینەوەکانی فرۆید بە تایبەت ئەوانەی کە پەیوەندیان بە نەستەوە هەیە (سەرنجتان بۆ ئەوە رادەکێشین کە لە لێکۆڵینەوەی پێشویدا لەسەر ئافرەت فرۆید لە شیکردنەوەکانیدا پشتی بە جیاوازی بیۆلۆجی بەستووە) رۆڵی خۆی هەبووە لە گۆڕینی لێکۆڵینەوە لەسەر ئافرەت بە تایبەت ئەوانەی کە پەیوەستن بە چەمکە سێکسیەکانەوە لەسەرخانەوە بۆ ئەوەی کەلە ژێرخاندایە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانە یارمەتی





خستنەرووی چەوساندنەوەی ئافرەت و تێگەیشتن لێی لە سایەی سیستمی پەتریارکیدا داوە پاش ئەوە لێکۆڵینەوەکانی فرۆید رووبەرووی رەخنەیەکی زۆر بوونەوە کە بزووتنەوەی ئافرەتان ئاراستەی دەکردن و کاریگەرییان تەنها لە لێکۆڵینەوەی بزوتنەوەی ئافرەتانەی فەرەنسا خستبوو. ئەو بزووتنەوەیشی کە داوای رزگارکردنی ئافرەت بوو و لە فەرەنسا سەریهەڵدا بەهۆی ئەو خۆپیشاندانەی کە لەلایەن خوێندکار و کرێکارە رەشپێستەکان و ئافرەتانەوە رێکخرا بەتایبەتی لە ئەمریکا و فەرەنسا سەلماندی کە جیاوازی رەگەزی و چینایەتی ئەو کاریگەرییە کەمەی هەبوو کە لەم یەکگرتنە باسناکرێت. نوویسنەکانی سیمۆن دی بوفوار (Simon de beauvoir) و بێتی فریدان و کیت میلێت رۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە پەیدابوونی بزووتنەوەکەدا، بۆ یەکەمجار بابەتگەلێکی زۆر خرانەڕوو لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرا.

هەر لەکارەوە هەتا نوێنی جێگای نووستن و ژن ومێردایەتی، دەستەواژەی وەك (کاروباری کەسێتی دەبێت بەسیاسی) بوو بەدروشمێك بۆ دەسبەکاربوونی فێمێنیزم.

فێمێنیزم (ئافرەتگەری) وەك هەر تیۆرێکی فەلسەفی بنەماکانی پانوبەرینن و گرانە دەستنیشانبکرێن، بەڵام لە رەوتەکانی هەنە کەدەتوانین بیانناسینەوە، وەك رەوتی لیبراڵی، مارکسیزمی توندڕەو و سیکولوجی، شیکردنەوەی دەروونی و بوونگەری و پاشنوێگەری. هەموو ئەم رەوتانە چەند وەلامێك دەخەنە بەر

دەست لەمەڕ پرسیارکردن دەربارەی ئافرەتان. هەموو سەرزەنشتی ئەو ڕێگا و شێوازی چەوساندنەوانە دەکەن کە دێنە ڕێی ئافرەتان، و پێشوازی لەوڕێگا جۆراوجۆرانەیش دەکەن کەبەهۆیانەوە هەندێك لەئافرەتان توانییان زاڵبن بەسەر ئەو ڕژێمانەدا کەکۆتیان دەکردن، پاشان بەدیهێنانی مافی خۆیان بۆ بڕیاردان لەسەر چارەنووسی خۆیان، هەروەها هاندانیشیان بۆ خۆشەویستی و ژیان و خەندە و پێکەنین و هەستکردن بە بەختەوەری بەسیفەتی ئەوەی ئافرەتن.

## ١-ڕەوتی لیبڕاڵی:-

تۆنگ (Tong)[1] (١٩٩٢) وادەبینێت کەڕەوتی ئافرەتانەی لیبڕاڵی (Liberal Feminism) باشترین دەروازەیە بۆ ناسینەوەی بیروبۆچوونی فێمێنیزم و بنەماکانی-هەرچەندە کەزۆر لەوەی ئێستا وەردەگیرێت لەجەوهەریا جیایە یاخود دژ بەم ڕووگەیە. ڕەوتی لیبڕاڵی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە کۆمەڵ ڕوو لەو باوەڕە دەکات کەدەڵێت توانای عەقڵی و جەستەیی ئافرەت-بەپێی سروشتی تایبەتی خۆی-لەتوانای پیاوان کەمترە، لەبەرئەمە ئافرەتان لەنێوەندی ئەکادیمی و ئابووری و ژیانی گشتی دوورخرانەوە. بەهۆی ئەم سیاسەتی دوورخستنەوەیەوە، توانای ڕاستەقینەی زۆرینەی ئافرەتان بەناتەواوی مایەوە. لیبڕاڵیستەکان بۆ ئەوە دەچن ئەگەر فرسەت و هەلی وەك یەك لەزانست و مافی مەدەنییا بۆ ئافرەت و پیاو وەك یەك بدرێ و بڕەخسێ، شتێکی سروشتی دەبێت ئافرەتان





بەرێژە و ڕادەی پیاوان پێشبکەون. بۆ بەدیهێنانی دادپەروەری و ئینسافی سێکسی-هەروەك ڕەوتی لیبڕاڵی جەختی لەسەر دەکات-پێویستە یاسای مامەڵەکردنی کۆمەڵایەتی والیبکەین کەدادپەروەرانە بێت، دووەمیش لەوە دڵنیابین کەهەر یەکێك لەوانەی بەشداری لەکاردا دەکەن بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵ و خزمەتکردنی، بەسوود دەبێت. هەروەها ئینسافی سێکسی نایگەرەکە هەر یەك لەدۆڕاو و براوە خەڵات بکەین هەتا ئەگەر ئەمە مانای خەڵات نەکردنی ئافرەتیش ببەخشێ.

ڕەوتی سیاسی فێمێنیزمە لیبڕاڵەکان تێگەیشتن و دەرکی تیایە بۆ سروشتی مرۆڤایەتی کەهەڵگری تاکگەرێتی خۆمانە بەو سیفەتەی کەبوونەوەری ئینسانین، و لە تواناماندا خۆی دەنوێنێت بۆ بیرکردنەوەی ئەقڵانی.

ئەو وتەیەیشی کە دەڵێت عەقڵە لە مەخلوقی تر جیاماندەکاتەوە وتەیەکی تا ڕادەیەك تەماوییە، لەبەر ئەمە بزووتنەوە فێمێنیزمە لیبڕاڵییەکان هەوڵیاندا پێناسەی عەقڵ بەڕێگای جۆراوجۆر بکەن یان جەخت لەسەر دیاردە ئەخلاقییەکان دەکەنەوە یا لەسەر توانا بۆ زانینی بەرێخستن.

لەبەرئەوە کاتێك کەعەقڵ بەوە دەناسرێت گوایە توانایە بۆ دەرککردنی بنەما عەقڵانییەکانی ئەخلاق ئەوە جەختکردنە سەر تێز و خرانەڕووە کە بە دەوری بەهای ئازادی و سەربەستی تاکیدا دەسوڕێتەوە. بەپێچەوانەی ئەمەیشەوە کاتێك کەعەقڵ واپێناسە دەکرێت گوایە توانایە بۆ حسابی باشترین هۆکاری

گەیشتن بە ئامانجە خوازراوەکان، ئەوە خستنەڕووە کە ئەو کاتە نرخ و بەهای بەدیهێنانی (خود)دا کۆدەبێتەوە.

پێناسەی فێمێنیزمی لیبڕاڵیش بۆ نرخ و بەها بەچەمکە ئەخلاقییە وەگەڕخەرەکەیدا هەرچۆنی بێت، تەبایی هەر ئەمێنێت لەمەڕ ئەوەی کەکۆمەڵگای دادپەروەر ڕێگا بەتاکەکانی دەدا مومارەسەی خودێتی خۆیان بکەن و لەهەمان کاتیشدا ئامانجەکانی خۆیان بەدیبهێنن. بۆیە بزووتنەوە لیبڕاڵییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کەمافەکان دەبێت مومارەسەکردنی چاك و بەکەڵك بخەنە پێشەوەی بایەخی خۆیانەوە، بەواتایەکی تر، سیستمی تەواومان لەسەربەستیی تاکی پەسەندە و بڕوبیانوداریشە، چونکە ئەم مافانە ئەو چوارچێوەیە پێکدەهێنن کەهەمووومان لەڕێگایەوە دەتوانین بەرژەوەندی سەربەست و بێلایەنی خۆمان هەڵبژێرین بێ ئەوەی زیان بە بەرژەوەندی کەسانی تر بگەیەنین.

شایەندانێکی (الاولویە) لەم جۆرە سەربەستیی ئایینشی تیایە (بۆ نموونە).جەختکردنی ڕەوتە لیبڕاڵییەکان لەسەر سەربەستی ئایینی پەیوەست نییە بە ئایینەکان خۆیانەوە ، بەقەدەر ئەوەی پەیوەندی بەسەربەستی مرۆڤەوە هەیە لەمومارەسەکردنی ئاییندا، هەرچ ئایینێك بیبێت. ئەمەی لەم ڕووەوە بۆ ئایین دەبێت، بەسەر چەمکەکانی تری ژیانیشا پیادە دەکرێت.





ڕووگەی هاوچەرخی فێمێنیزمی لیبڕاڵی لەسەر ئەو بنەمایەیە کە ڕونیدەکاتەوە: کە ئامانجی گرنگی بەدیهێنانی ڕزگارکردنی ئافرەتان بریتیە لەچەسپاندنی یەکسانی جنسی، هەندێك جار پێی دەوترێت، دادپەروەریی جنسی (لەڕووی مێیەتی و پیاوەتییەوە).

ئەوەی کە فێمێنیزمی لیبڕاڵی ئارەزوی دەکات بیکات ڕزگارکردنی ئافرەتانە لە ڕۆڵی جنسی زۆردار، مەبەستی لەمە ئەو کۆمەڵە دەورانەیە کەوەك ڕەوایبەخشێك بەکاردێن بۆ ئەوەی شوێن و پایەی نزمتر بدرێن بەئافرەت یا بەهەموو شێوەیەك و بەیەکجارەکی هەموو ڕۆڵ و پلە و شوێنێکی ئەکادیمی و ژیانی گشتی و بازاڕی کاریان لێ حەرام بکەن ڕەوتە فێمێنیزمە لیبڕاڵییەکان سەرنجم بۆ ئەوە ڕادەکێشێن کە کۆمەڵی بتریارکی باوەڕی بەوەیە ڕۆڵی گونجاو بۆ ئافرەتان مومارەسەکردنی کۆمەڵێك پیشەی سنوردا و دەستنیشانکراوە، وەکو فێرکردن، ئیشوکاری تەندروستی و ئیداری، هەروەها وادەبینێت کەئافرەتان توانای ئەوەیان نییە ئەرکی سەرکردایەتی کردن یا کاروباری ئایینی و ئابوری و بەرهەمهێنەر ببەن بەڕێوە . کۆمەلی نێرینە (الذکوري)وا دەبینێت ئیشوکاری ئاسان بۆ ئافرەتان دەگونجێت" چونکە پێویستی بە خەسڵەتگەلێکە پەیوەندییان بەکەسێتی مێینەوە هەیە–خودێکی بەتەماعە.

لەهەمان کاتدا، لەلای وایە کە پیشەی گونجاو بۆ پیاو ئەو پیشەیەیە کەپەیوەندی بەکەسێتی نێرینەوە هەیە، کەسێتی توانادار و باوەڕبەخۆ.

بزوتنەوە و رەوتە لیبڕاڵییەکان وادەبینن ئەم جۆرە وەسفکردنە سێکسیە، تیایدا ناشیرینترین مانای جیاوازی و نایەکسانی نێوان هەردوو رەگەزەکەی تیا دەنوێنرێت، بۆیە پێویستە چارەسەربکرێت، ئەو کاتە پێویستە پیاوان وەك ئافرەتان دەرك بە ئامانجی رزگاربوون بکەن.

فێمێنیزمە لیبڕاڵیەکان بەردەوام دەبن لەسەر گفتوگۆی خۆیان لەسەر بنەمای نووساندنی سێکس (sex) و رەگەزی (gender) لەدەستدانی ئافرەتان دەسەپێنێت بۆ داواکاری پێویستیان بۆ چەند پیشەیەك کەوادەبینرێن بەتەواوی پەیوەست و پاوانی پیاوانن:

پێچەوانەی ئەمەیش راستە.

شایانی ئاماژە پێکردنە دابەشکردنی سێکسی وەك جنس (sex) مەبەست لێی جیاوازی جیناتە (x x) بۆ مێ و (x y) بۆ نێر، و جیاوازی تەشریحییە، لەکاتێکدا سیمای کەسێتی و وێنەی جۆربەستوی (النمطیة) ئەو هەڵسوکەوتەیە کە جۆرە لەگەڵ پێکهاتەی رۆشنبیری چەمکی مێینە و نێرینە.

بۆ نمونە کۆمەڵگای ئەمریکی، لەپێشدا هەڵەنەبووە کەلائیحەی دۆزیوەتەوە کارکردنی ئافرەتانی لەبواری پیشەی پیاوانەدا قەدەغە کردووە، وەك ئەو پیشانەی کەپەیوەندییان بە (تەنقیب)





و خزمەتکردن لەمەیخانە و بازاڕ، کارکردن لەئێشکگرتن و کاری شەوانە یا کاری ئیزافی وە هەبووە.

جیاوازیکردن لەنێوان هەردوو رەگەزەکەدا هێشتا هەرماوە، بۆ نمونە، ئەگەر پیاوێك و ژنێك بۆ یەك پلەی ئێداری بپاڵێورێن (پێموایە دەبێت لێرەدا مارگرێت تاتشەر جیابکرێتەوە) ئەوە زۆربەی زۆری دەنگدەران دەنگی خۆ یان بەپیاو دەبەخشن، چونکە باوەڕیان وایە ئافرەتان سۆزدار و توندڕەو زوگۆڕن، خاوەنی هەستی تیژن.

هەمان واقیع لەپاڵ بڕیاری خاوەن ئیشەکە پیاوی لاباشترە تا لەهەندێك جێگا و شوێندا کاربکات، ئافرەتیشی لێ بێبەشدەکات تەنانەت ئەگەر هەمان ئامادەگی تیا بێت.

هەرچەنە کەحاڵەتی واهەیە ئیدعای ئەوەی تیادەکرێت کەپیاو شانسی لەئافرەت باشتر نییە، پیاوانیش لەواقیعدا قوربانیی جیاوازی رەگەزن، تەنانەت ئەگەر یاسایش بە بەزەیی بێت لەگەڵیاندا،

بەڵام هەندێك بزوێنەری زەبتوڕەبتی کۆمەڵایەتی وانییە، بۆیە دەبیستین خێزانی واهەیە شکاتدەکات و ئەوە رەتدەکاتەوە پشت بەپیاوێك ببەستێت تا منداڵان بەخێوبکات، یا گلەیی و شەکوا لەقوتابخانەی پەرستیاری دەکەن کەپیاوی (شیاو) نابینێت تا پلە ئیدارییەکانی خۆی پێبردرێت. هەرچەندە کەئافرەتە لیبڕاڵەکان ئامادەن بۆ هاوسۆزی لەگەڵ ئەو پیاوانەدا کەقورسی دەبینن لەپیشەی کارکردن لەگەڵ منداڵاندا، بەهۆی

**جیاوازی سەر زەمینەی واقیع، بەڵام ئەوان تێبینی ئەوە دەکەن ئەوەی کە پیاو دەیچێژێت و روبەڕوی دەبێتەوە نەلە دوورەوە و نەلە نزیکەوە پەیوەندی بە ئەزموونی ئافرەتەوە نییە.**

**بەڵام بەشێوەیەکی گشتی، پێکهاتەی کۆمەڵ پیاوی لا باشترە وەك لەئافرەت بۆ کێبڕکی لەبازاڕی کاردا کەلە خیلالیوە کۆمەڵ بە : هێز و پایەو مادە خەڵات دەکات.**

**لەنووسینی نوێی فێمێنیزمە لیبڕاڵەکاندا رەوتێکی نوێ دەرکەوتووە، ئەویش رووکردنە ئەو چەمکانەی ئەو ئارەزووە رەتدەکەنەوە دەیەوێت کەسان لەسەر بنەمای رەگەز هەڵسەنگێنێت.**

**لێرەدا مەبەستی لەم چەمکە چەمکی کەسی بێلایەنە (ئەندامی مێینە و نێرینەیش لەخۆدەگرێ)، ئەگەر بیر لەم چەمکە بکەینەوە، ئەوە باشترین رێگای سەرەکی تاك کەبەهۆیەوە دەتوانین زامنی ئەوە بکەین کە کەس (پیاو بێت یان ژن) لەسەر رەگەزەکەی تووشی زیان نەبێت ئەوەیە ببین بەهەڵگری هەموو نیشانە و سیفەت و هەڵسوکەوتی مێینە و نێرینە لەناخماندا. ئافرەت و رەوتە فێمێنیزمەکان**

**دەڵێن، کاتێك کە هەموو وایان لێبێت، ئەوە ئیتر هیچ هۆیەکی پاڵنەر نامێنێت بۆ جیاوازیکردن دژی هەر کەسێك بێت بەبیانوی رەگەزەوە. بێگومان ئەمە پرۆسەی تێکەڵوپێکەڵ کردنی هەموو کرموزومات وهرمۆناتی ناوێ بۆ دروستکردنی مرۆڤێکی نێرەموك (نەنێر بێت و نەژن) ئەگەر ئەمە دوا رێگا**





**چارە نەبێت بۆ دانانی کۆتایی جیاوازی پەیدابوو لەرەگەزەوە، لە جیاوازی جینات، یا لەنێرینەو مێینەوە بێت.**

**گفتوگۆی جیاواز لەمەڕ جیاوازی رەگەز و رۆڵی رەگەز و بەنێرەمووککردن (التخنیث) یارمەتی فێمێنیزمی لیبڕاڵی دا تا بایەخی خۆی لە سەربەستی و یەکسانی و دادپەروەری بۆ هەمواندا کۆبکاتەوە، چونکە چەند چەمکێك وەك رۆڵی رەگەزیی و خەسڵەتەکانی بەرەو شێوازی هەڵسوکەوتی وادەچێت نەشونماکردنی کۆمەڵایەتی وا پتەودەکات پاڵ بەهەردوو رەگەزی نێر و مێوە دەنێت بەرەو مەیدانی بایەخ و پیشە" کوڕ بۆ ئەوە پێدەگات نێر بێت کچیش بۆ ئەوەی مێ بێت.**

**ئەوانەی لەبواری سایکۆجیا و سۆسیۆلۆجیا و ئەنتروپۆلوجیا ئیشدەکەن تاریفی مێینە و نێرینە لەخیلالی وێنەی جۆرگیری باو و کارتێکراو بەرەگەز، و چین و هۆکاری ئیتنییەوە دەکەن، بۆیە لەکۆی ئەو شتانەی کەدەبێت لەپیاودا هەبن تا ببێت بەنێرینە لەکۆمەڵگای عەرەبدا : عەقلانیەت و هەڵپە و سەربەخۆییە، ئەو شتانەیشی کەدەبێت لەمێدا هەبن تاببێت بەمێینە : سۆز و دایکایەتی و پشتبەستنە بەکەسانی تر.**

**بێگومان ئەمە بوونی چەند تیۆژێکی ناو کۆمەڵ ناخاتە لاوە کەپێچەوانەی ئەم یاسایەن. هەندێك نێر سیمای مێینەیان تیا دەرئەکەوێت هەندێك مێیش سیمای نێرینە، بەڵام ئەو کەسانە جیان و لەیاسا باوەکە دەرچوون. ئەو ئافرەتەیشی کەخەسڵەت و سیمای پیاوانە دەنوێنێ لەلایەن کۆمەڵی خۆیەوە سزا**

دەدرێت، تەواو وەك ئەو پیاوەی کە مێینانە رەفتار دەکات. ئافرەتی لەو جۆرە بەنزمتر و لەخوارەوەی ئافرەتی راستەقینە دەژمێرێت، پیاوی لەم جۆرەیش بەهەمان شێوە سەیردەکرێت. لەپێناوی رزگارکردنی ئافرەت و پیاو لەو قاڵبە چەسپاوانەی کەنێرینە و مێینە دروستدەکەن فێمێنیزمە لیبراڵەکان بەپێویستی دەزانن رەگەزێکی بێلایەن (نێرەموك) گەشە بسێنێت .

باشترین سیمای نێرینە و باشترین سیمای مێینە بەرجەستە بکات. بێگومان ئەمەیش دەخالەتی زانست و پزیشکی دەوێت و مانای مەحاڵبوونی پیادەکردنی ئەم چارەیە دەبەخشێت، هەروەها تووشی بەرپەرچدانەوەیەکی زۆر دەبێتەوە، چونکە پێچەوانەی ئایین و سروشتی بەشەر دەبێتەوە.

فێمێنیزمە لیبراڵەکان لەم ساڵانەی دواییدا بەچاوی هەڵسەنگاندن و چاککردنەوە بە هەڵوێستی رەخنەیی و فیکری خۆیاندا چوونەوە، بەتایبەت لەوەدا باوەڕبهێنن بەئارەزوکردنیان لەپەسەندکردنی بەها و نرخی نێرینە، بەو سیفەتەی بەهاو نرخی ئینسانییە.

ئەمە جگە لەو رەخنەیەی کە دەربارەی تەوەری جۆراوجۆر لەلایەن فێمێنیزمی غەیرە لیبراڵەوە ئاراستەیان دەکرا، بەتایبەت سەبارەت بەئارەزویان لەگەورەکردنی گرنگیی سەربەستی تاکخوازی لەسەر حسابی بەرژەوەندی گشتی، و ئارەزویان بۆ بێلایەنی رەگەزی ( Gender neutral





humanism) لەسەر حسابی فێمێنیزمێکی خاوەن جنسێکی دیاریکراو (Gender spcific Feminism).

### ٢- رەوتی فێمینیزمی مارکسی:

رەوتی فێمێنیزمی مارکسی (Marxist Feminism) بۆ ئەوە دەچێت کەمەحاڵە بۆ هەر کەس بێت بەتایبەتی ئافرەت هەڵی راستەقینە و یەکسانیان لەکۆمەڵێکی چینایەتیدا دەسبکەوێت، لەکۆمەڵێکی لەم جۆرەدا کەبەروبووم و دەسکەوت و (مەورید) لەلایەن کەسانی چەوساوەوە فراهەمدەکرێت و بەرهەمەکەیشی دەچێتە دەستی کەمینەیەکی بەهێزەوە. بۆیە ئەم رەوتە پێی وایە چەوساندنەوەی ئافرەت لەناو یاسای موڵکایەتی تاکە کەسییەوە رواوە، ئەو دامودەزگایەی کە هیچ جۆرە یەکسانییەك ناهێڵێت کەکۆمەڵی ئینسانی بەدیهێناوە، هەروەها پێی وایە مولکیەتی سەرچاوەی بەرهەمهێنان و سەروەت و سامان بەهۆی چەند کەسێکی کەم لەپیاوان بێگومان سیستمێکی چینایەتی دروست دەکات و سەرهەڵدان و گەورەبوونی سەرمایەداری و ئیمپریالی لەئەنجامەکانێتی.

ئەگەر رۆژێك لەرۆژان بۆ ئافرەتان هەموویان-نەك تەنها کەمینەیەکیان-رزگاربوونی لەواو هاتەدی ئەوە سیستمی سەرمایەداری کۆتایی دێت تا سیستمی کۆمۆنیزم جێگای بگرێت، چونکە لەسایەی کۆمۆنیزمدا کەس لەکەس بەرپرس نابێت، یا کەس لەلایەنی ئابوورییەوە لەسەر کەسی تر ناژی،

لەسـەر ئاسـتی ئـابووری، ئافرەتـان بەسەربەسـتی  لـەپیاوان جیادەبنەوە، و بەم پێیە لەگەڵ پیاواندا یەکسان دەبن.

ئەگەرچی پەیوەندی فیکری لەنێوان فێمێنیزمی شۆسیالیزم و فێمێنیزی مارکسیدا هەیـە، بـەڵام بـەلای کەمـەوە جیاوازییـەکی سەرەکی هەیە ئەم دوو ڕەوتە جیادەکاتـەوە. ئەمەیـە  کە تۆنگ (Tong ١٩٩٢) ئامـاژەی پێـداوە وەختـێ نوسـیوویەتی : لەکاتێکـدا فێمێنیزمـە شۆشیالیـستەکان باوەڕیـان وایـە کـە دابەشکردنی جنسی و سیستمی چینایەتی دەورێکی بنەڕەتی یەکسان لەهەوڵدان بۆ ڕاڤەکردنی هەموو چەوساندنەوەیەك دژی ئـافرەت دەبیـنن، فێمێنیزمـە مارکـسیەکان باوەڕیـان وایـە کەسیـستمی چـینانەتی لەکۆتاییـدا ڕاڤـەکردنێکی باشـتر بـۆ ئەرکی  ئافرەت و پلە و پایـەی پێشکەش دەکات. وەك ئافرەتە مارکیـسەکانیش دەڵـێن–ئافرەتـە بورجوازەکـان مامەڵـە لەگـەڵ هـەمان خـبرەی چەوسـاندنەوە ناکـەن وەك ئـەوەی ئافرتـانی پرولیتـار پێـوەی دەنـاڵێنن. بۆیـە جیاکردنەوەکـەی فێمێنیزمـە مارکسییەکان بانگەوازیانە بۆ هـەموو ئافرەتـان، بورجوازییـەکان بن یا پرولیتارەکان، بۆ گەیشتن لـە چەوساندنەوەی ئافرەت و دەرککردنیشی، بەو سیفەتەی کەبەرهەمی سیستمی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری سـەرمایەدارییە نـەك بـەو سـیفەتەی کەبەرهەمی هەڵسوکەوتی تاکی بەیەکاچوو بێت.

هـەر وەك چـۆن چـەمکی سروشـتی مرۆڤایـەتی لەتیۆرداڕشـتنی فێمێنیزمـە لیبڕاڵەکانـدا گفتوگـۆی لەسـەر کـراوە، هـەمان چـەمك





لەلایـەن فێمێنیزمـە مارکسییەکانیـشەوە  لێـی کۆڵراوەتـەوە و گفتوگـۆی لەسـەر کـراوە. لەکاتێکـدا کەفێنمیزمـە لیبڕاڵـەکان وادەبیـنن کەئـەوەی مـرۆڤ لـەئاژەڵ جیادەکاتـەوە بریتییـە لـە کۆمەڵێك توانا، وەك توانای بیرکردنەوەی عەقڵانی، بەکارهێنانی زمان و کۆمەڵێك مومارەسەکردنی وەك " ئایین، هونەر، زانست، کـــۆی هەڵـــسوکەوت و بۆچـــوونەکان" وەك کێبڕکـــێ، و بەهەندوەرگرتنی خود پێش ئەوی تر، فێمێنیزمە مارکسیەکان ئەم تێزەی لیبڕاڵەکان ڕەتدەکەنەوە، لەسەر ئەو بۆچوونە جەخت دەکەنەوە کەدەڵێ ئەوەی کە دەمانکات بە بەشەر ئەوەیە کەئێمە هەڵئەسـین بـە بەرهـەمهێنانی ئـەو وەسـیلە و کەرەسـتانەی بـەردەوامیی  مانـەوەمان زامندەکـەن. ئێمـە ئـەم شـێوەیەی کـە لەسـەرین و بـەهۆی ئەوەوەیـە کـە دەیکـەین بـۆ زۆرکردنـی پێویـستییە سـەرەکییەکانی  وەك چـالاکی بەرهـەمهێنان، وەك ڕاو، کشتوکاڵ،بینا.  دەڵێ بەپێچەوانەی مەخلوقاتەکانی ترەوە، وەك هـەنگ، مێرولـە کـە غـەریزە چـالاکییەکانیان دەخاتەگـەڕ، ئێمـەی بەشـەر بـەئارەزوو مەبەسـت ویـستی خۆمـان خۆمـان دروست دەکەین و ڕێکدەخەین، لەڕێگای کاری گۆڕین و زاڵبوون بەسەر سروشتدا.

گوتـەزا مارکـسییەکە (بەشـەر خۆیـان خۆیـان پێکـدەهێنن) ئـەوە ناگەیـەنێت کـەپیاوان و ئافرەتـان  خۆیـان  والێکـردووە یـا بـەو جۆرە کـردووە کەئێستا هـەن و دەبینـرێن، بـەڵکو مەبەسـت لێـی ئەوەیـە کـەپیاوان و ئافرەتـان لـەڕێگای کەڵەکـەبوونی پرۆسـەی

بەرهەمهێنانەوە ئەو كۆمەڵگایە دروستدەكەن كەئەویش هەڵئەسێ بەڕۆڵی خۆی بۆ پێكهێنانیان. لەلای ماركسییەكان هێزی ماددی كەخۆی لەپرۆسەی بەرهەمێنانەوەی ژیانی كۆمەڵایەتیا دەبینێتەوە بەبزووتنەوەی سەرەكیی مێژوو دادەنرێت، هەروەها ماركس لەو چۆنێتییە دواوە كە شێوەی بەرهەمهێنانی ژیانی كۆمەڵایەتی دەیكات لەپێكهێنانی پرۆسە گشتییەكاندا لەسەر ئاستی سیاسی و كۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی ژیان.

ماركسییەكان باوەڕیان وایە كەهۆشی مرۆڤ بوونی دیاریناكات، بەڵكو بوونی كۆمەڵایەتی هۆشی دەستنیشان دەكات.

فێمێنیزمە ماركسییەكانیش تەواو وەك ماركسییەكان لە بۆچوونی گشتییاندا، باوەڕیان بەوەیە بوونی كۆمەڵایەتی سنوردانەری هۆشە.

لەبەر ئەمە وتنی (كاری ئافرەت هەرگیز تەواو نابێت) بۆ فێمێنزمی ماركسی لە تەنها وتەیەكی بەنرخ زیاترە، ئەوە وەسفی سروشتی كاری ئافرەتە. ئافرەت وێناكردنێكی تایبەتی و چەمكی خۆی پێكدەهێنێ، پێك نەدەهات ئەگەر رۆڵی لەناو خێزاندا و جێگای كاری لە پلەیەكی كەمتری لەڕووی كۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە پێنەبەخشیدایە. لەبەر ئەوە فێمێنیزمی ماركسی باوەڕی وایە بۆ ئەوەی تێبگەین بۆچی ئافرەتان بەڕێگاو شێوەیەك دەچەوسێنرێنەوە كەتووشی پیاوان نابنەوە، ئێمە پێویستمان بەوەیە ئەو پەیوەندییە شیبكەینەوە





كە پایەی ئافرەت لە بازاڕ كار و بۆچوونی ئافرەت بۆ خۆی كۆدەكاتەوە.

خاڵی سەرەكی پایەی ئافرەت لەلای فێمێنیزمە ماركسییەكان ئەوەیە كەبیخەیتە بازاڕی كارەوە، لەبەرئەمە تیۆركارییان پەیوەستە بەباوەڕیان بەوەی كەكاركردنی ئافرەت سنوردارنەری فكرێتی، دوای سروشتی دەكەوێت.

تیۆری ماركسی لەئابوریدا، سەرمایەداری بەسیستمی پەیوەندی ئاڵوگۆڕكراو دادەنێت، ئەو راستیەی ئابووری دەشارێتەوە كەسیستمێكە بۆ پەیوەندی هێزەكان. لەبەر ئەوە فێمێنیزمە ماركسییەكان وادەبینن كەراستیی داكۆكیكردنی بیریار ە سەرمایەدارەكان لەهەندێك پەیوەندیی نزیك لەپەیمانبەستنەوە" وەك بەكرێدانی منالًدان ( Surrogte Mother) وەك نمونەیەك بۆ مومارەسەكردنی سەربەستی هەڵبژاردن، بەتەنها رێكەوتێك ناژمێردرێت. ئەوەی ئەو بیریارانە دەیشارنەوە–هەر وەك فێمێنیزمە ماركسییە كان جەختی لەسەر دەكەن بەربەرەكانیی هێزی بزوێنەرە كەبەشێوەیەكی رونتر ئەو راستییە روندەكاتەوە كەلەپاڵ ئەو پەیمانبەستنانەدایە. كاتێك ئافرەت كاری فرۆشتنی خزمەتی جنسی یا توانای منداڵهێنانی هەڵدەبژێرێت، ئەمە تەنها بۆ ئەوە دەكات، چونكە شتێكی تری وەهای بەنرخی نییە لەبازاڕی كاردا بیفرۆشێت، واتە هەڵی بۆ كردنی ئەو شتە زۆرتر و گەورەترە لەهەڵی هەڵبژاردن بەویستی خۆی.

فێمێنیزمە مارکسیەکان وەك هەموو ڕەوتەکانی تری فێمێنیزم لەسەر یەکخستنی ڕیزی ئافرەتان سوورن، هەر بۆیە چەمکەکانی تیۆری مارکسیزم وەك چینایەتی و هۆشیاری چینایەتی و هۆشی ساختە، لەتیۆرکارییەکانیاندا ڕۆڵ دەبینن. لەناو کۆڕ و کۆمەڵ و کۆبوونەوەکانی ئافرەتە مارکسیستەکاندا گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە و پرسیارێکی زۆر دەکرێت، دەربارەی ئەوەی ئایە ئافرەتان دەبن بەچین؟ لەلایەکەوە دەبینین هەندێك ئافرەت ژن یا کچ یا هاوڕێ و دۆستی پیاوگەلێکی برجوازین و لەلایەکی ترەوە دەبینین هەندێکی تریان ژن و کچ و هاوڕێی پیاو گەلێکی پرۆلیتارن. بەم چەشنە دەرئەکەوێت ئافرەتان لەچەمکی وردی چینایەتیدا بەو شێوەیەی کەمارکسیزم بۆی دەچێ چینێکی جودا پێکناهێنن. لەلایەکی دییەوە، تواناو شارەزایی زۆر لەئافرەتان لەئیشوکاری ناوماڵدا لێکچونێکی تەواوی هەڵگردوە بۆ بەرپاکردنی خەباتێکی یەکگرتوو بۆ پەیداکردن و وەدیهێنانی کرێدەستێك بەرامبەر ئیشوکاری ناوماڵ.

لەپێناوی داننان بەوەی کەئیشی ناو ماڵ کارێکی ڕاستەقینەیە، زۆر لەئافرەتان بۆخۆیان ئەوەیان زانیوە کەچینێکی کرێکارن، بەڵام ئەم هۆش و زانینە پێیدەگوترێ هۆشی ساختە" چونکە گونجاو نییە دایکایەتی و خزمەتی ژیانی ژن و مێردایەتی بە ئەرك دابنرێت، چونکە ئەم ئەرکانە، ئافرەت بۆ خۆشەویستی پێشکەشیان دەکات. لەو چمکە سەرەکییانەی تیۆری مارکسیزم





و تیۆرکاریی فێمێنیزمی مارکسی کەدەکرێت بخرێتە سەر چینایەتی و هۆشی چینایەتی چەمکی نامۆبوونە. لەکۆمەڵگای سەرمایەداریدا، وەك مارکسیزم بۆی دەچێت، پەیوەندیە مرۆڤایەتییەکان بە نامۆبوون وەسف دەکرێن. تاك هەست بە بوونی خۆی ناکات تەنها لەو کاتەدا نەبێت کەلەکەسانی تر جیا دەبێتەوە. لەم بوارەدا ئان فۆڕمان (Ann Foreman ١٩٧٧) [٢] وای بۆ دەچێت سەبارەت بەئافرەت بارەکە گەلێك خراپترە لەوەی لای پیاو" پیاو لەکاری کۆمەڵایەتی ئیش و پیشەسازی و لەناو خێزاندا بوونی هەیە، بۆیە دەتوانێت چی لەم بوارە جیاوازانەدا هەیە دەریانبڕێت، بەڵام ژن جێگای ناوماڵە. بەشتکر دنی پیاو لەپیشەسازی و بازاڕی کاردا لەڕێگای زەوتکردنی بەرهەمی ئیشێوە یەکێك لە جۆرەکانی نامۆبوون پێکدەهێنێت، بەڵام کاریگەری نامۆبوون بۆ سەر ئافرەت و هۆشی، شێوەی چەوسێنەرتر لە خۆدەگرێت. لەڕێگای پەیوەندی بەئافرەتەوە پیاو بۆخۆی بەدوای چارەیەکدا دەگەڕێت هەناسەیەکی پێبدات، بەڵام ئەو مەنفەسە بۆ ئافرەت نییە. ئەم پەیوەندییە گەرمە بۆخۆی بونیاتی سەرەکی چەوسانەوەی پێکدەهێنێت.

بۆیە نامۆبوونی ئافرەت بناغەی موعانات و نەهامەتی سەبارەت بەخۆی پێکدەهێنێت، چونکە خۆی وادێتە پێش چاو نوێکەرەوە و پەرەپێدەرە بۆ تێرکردنی پێویستی ئەوانی تر،

ئامادەبوونی کەسانی تریش بەئامادەنەبوونی هەستکردنی بەخۆی دەبینێت.

بەپشتبەستن بەمە، فێمنیزمە مارکسیزمەکان وادەبینن کەئەرکی یەکەمیان دروستکردنی جیهانێکە تیایدا ئافرەت بتوانێت خۆی وەك کەسێکی کامڵ و تەواو نەك پارچەکراو ببینێت.

بەپێچەوانەی ژیانی مرۆڤەوە لەژێر سایەی سیستەمی سەرمایەداریدا، فێمێنیزمە مارکسیەکان وادەبینن کەژیانی مرۆڤ لەسیستەمی شیوعیدا سەربەستە، نەك تەنها بەوەی کەدەیکات بەڵکو لەوەیشدا کەدەیەوێ و ئارەزوویدەکات، چونکە هێزی خۆی هەیە بۆ دروستکردنی ئەو سیستەمەی کەپێکیدەهێنێت.

لەناو دێڕەکانی مارکسیزما، خوێنەر دەتوانێ پەیمانێك ببینێت بۆ بنیاتنانەوەی سروشتی مرۆڤایەتی بەو شێوەی کە هەموو دابەشکردنێکی روخێنەرانە کە هەندێك دووردەخاتەوە و هەندێکی تریش دەکات بەگەورە قەدەغە دەکات. مارکسیزم پەیمانی ئەوەیش دەدات کەهەموو سەربەستبکرێن، ئەمەیش پەیمانێکە ئافرەتان ئارەزو دەکەن کەسێك ببیننەوە بیپارێزێت.

مارکسیزم باوەڕی وایە مرۆڤ ئەو کۆمەڵە پێکدەهێنێت کەئەمی مرۆڤ پێکدەهێنێت، هەروەها باوەڕی بەتوانای ئافرەت و پیاوە بەیەکەوە، بۆ پێکهێنانی بنیاتی کۆمەڵایەتی، و فراهەمکردنی ئەو رۆڵە کۆمەڵایەتییەیش کە دەهێڵێت نێر و مێ بەشێوەیەکی تەواو دەرك بە توانای مرۆڤایەتی خۆیان بکەن.





زۆر لەو مەسەلە و کێشانەی کەفێمێنیزم بەهەموو رەوت و ئاراستەکانیانەوە شیاندەکاتەوە و گفتوگۆیان لەسەر دەکات، هەمان گرنگیی بۆ شیکردنەوەی فێمێنیزمی مارکسی پێکناهێنن، تەتانەت لەنووسینە نوێکانیشدا.

نموونەیش، ئەو پرسیارانەن کەپەیوەندییان بەمنداڵبوون، و ئەو کارانەوەیە کەمەودای سێکسییان هەیە وەك (رێگا گرتن لەمنداڵبوون، نەزۆکی، لەباربردن، وێنەی رووت و پەلاماردانی سێکسی، توندوتیژی و بەزۆرگەرەك بون لەئافرەت).

فێمێنیزمە مارکسییەکان بەرەو جەختکردن لەسەر ئەو کێشانەی کەپەیوەستن بەکاری ئافرەتەوە رۆیشتوون. لەم روانگەیەوە یارمەتی زۆریان داوە بۆ تێگەیشتن لەزۆر مەسەلەی پەیوەندیدار، وەك : چۆنێتی پەیوەندی خێزان لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداریدا، چۆ نێتی پەراوێزخستنی کاروباری ئافرەت لەماڵدا، بەو سیفەتەی کارێکی راستەقینە نییە، دواجاریش چۆنێتی ئەو کارو پیشە زۆربێزارکەر و کەم کرێیانەی کەبەشێوەیەکی گشتی دەیدا بەئافرەتان. بەم شێوەیە کار بۆ فێمێنیزمە مارکسیەکان دەبێت بەتەوەری تیۆرکاری، تەنانەت ئەگەر تەفسیرێکی تەواویشی بۆ چەوساندنەوەی ئافرەتان نەبێت، شیکردنەوەیان بۆ سروشتی ئەم کارە و ئەرکی لە سیستەمی کۆمەڵاتیدا قەناعەتهاوەرە ئەگەر بەشێوەیەکی بەشبەشیش بێت.

لەژیانی کۆمەڵایەتیدا کەپێش سەرهەڵدانی سەرمایەداری کەوتووە، خێزان یا خود ماڵ، سەنتەری بەرهەمهێنان، کاری دایك و باوك و کوڕ و خزم و کەسوکار هەموویان لەگەڵ یەکترا بۆ دروستکردنی خۆیان نەوە دوای نەوە کاریانکردووە. ئافرەتان چێشتیان لێناوە، خواردنیان ئامادەکردووە، کاری کشتوکاڵیان کردووە، منداڵیان خستۆتەوە و بەخێویانکردووە. ئەم کارەیان لەپاڵ کاری پیاودا، بناغەی چالاکی ئابوری خێزانیان پێکهێناوە.

بەلام پاش سەرهەڵدانی پیشەسازی و گۆڕینی بەرهەمهێنان لەچوارچێوەی ماڵەوە بۆ شوێنی گشتیی کار، ئافرەتان رۆڵی خۆیانیان لەژیانی عەمەلیدا دۆڕاند، بوون بەکەسانێکی غەیرە بەرهەمهێنەر، بەرامبەر ئەو بەرهەمەی کەپیاو بەکرێ دەیدا.

داننەنان بەوەی کە (بەرهەمی) ئافرەت بۆ بەشەر بەرهەم نەبێ، داننانیش بە (بەرهەمی) پیاو بۆخۆی بۆخۆی سەرنەکەوتنە لەگەیشتن لەچەمکی زاراوەی بەرهەمهێنان کەتیۆری مارکسیزم گفتوگۆی لەسەر دەکات.

بۆیە ئەوەی کەرقی زۆر لەفێمێنیزمە مارکسییەکانی هەڵئەسان، ئەو چوارچێوەیە بوو کەلە رێگایەوە سیستمی سەرمایەداری سروشتی کاری ئافرەت و ئەرکەکانی وێنادەکرد، پاشانیش ئەم کارەی دەخستە پەراوێزەوە.

ئافرەتان بە بەردەوامی واسەیردەکرێن گوایە سەرفکەرن و بەس (مستهلکات)، وەك ئەوەی رۆڵی پیاو کرێیە و رۆڵی ئافرەتیش





پەرشکردنی، بەلام فێمێنیزمە مارکسییەکان لایان وایە کەئافرەتان بەپلەی یەك بەرهەمهێنەرن و بەپلەی دوویش سەرفکەر.

ئیشوکاری ناوماڵ–وەك م.بنسون (M.Benston١٩٦٩) دەڵێ" به بەردەوامی ئافرەت لێی بەرپرس دەبێتەوە.

کاتێکیش کەئافرەتان لەماڵ دەچنە دەرێ بۆ کارکردن، پێویستە لەسەریان گونجانێك پێکبهێنن لەنێوان پێداویستی کاری دەرەکی و کاری ناوماڵ بەیەکەوە. ئافرەتان–بەتایبەت ئەوانەیان شویانکردووە، هەروەها دایکان و ئەوانەیشیان کەلە دەرەوە کاردەکەن ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن، بەشداریکردنیان لەگەڵ هێزی کرێکارا مەرجدارە بە بەردەوامی توانایان بۆ ئەنجامدانی بەرپرسێتی تەواویان لەناوماڵدا. ئەم بارە بەشێوەیەکی تایبەتی لەو کۆمەلانەدا دەرئەکەوێ کەچوونەدەرەوەی ئافرەتان بۆ کارکردن سنوری سەربەستی تیا بۆ فراوان نەکردوون (وەك کۆمەلانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست) لەبەرئەوە چوونەدەرەوەی ئافرەت بەمەبەستی کارکردن بەس نییە بۆئەوەی سەربەستی خۆی پێبدرێت مادەم کاری ناومالی تایبەتمەندارە و لێی داوا دەکرێت. لەبەرئەمە بەئاسانی ئافرەتان هەر هەوڵ و رەنجی وەزیفی زیات دەدەن.

بابەتی ئافرەت خاڵی سەرەکی جیاواز پێکدەهێنێت لەناو دالانی فێمێنیزمی مارکسیدا" کەتیایاندا هەیە لەگەڵ کرێی مادیدایە بۆ کاری ناوماڵ تیایشیاندا هەیە رەتیدەکاتەوە.

بۆچوونی ئەوانەی کەلەگەڵ ئەم رایەدان پشت بەوە لە پاڵ ئیشی دەرەوەدا دەنوێنێ، ئەوەیە کە دەبەستێت کەتاکە وەسیلە بۆ کۆتایهێنان بەو ستەمەی کەخۆی لەبەرپرسی ئافرەت لەئیشی ناوماڵدا بێ کرێ لەپاڵ ئیش و کاری دەرەوەدا ئەوەیە کەئافرەتان لەبەرانبەر ئیشی ناوماڵیاندا داوای کرێی خۆیان بکەن، بەڵام ئەوانەیان کەلەگەڵ ئەم رایەدا نین گفتوگۆیان لەسەر ئەوەیە کەهەستان بەم کارە شتێکی قورسە.

ئەگەر دەوڵەت کرێی ئافرەتی خێزاندار بدات ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەنرخی ئەوەی کە دەیانداتێ بەسێ جار و چوارجار زیاتر دەبێت لەوەی کەدەیدات بەو ئافرەتانەی کەلە دەرەوەی ماڵ ئیشدەکەن، بێگومان ئەمەیش چەسپاندنی رێژەیەکی بەرزی باجدان دەگەیەنێت.

ئەمە جگە لەوەی کەئەم بۆچوونە وادەکات سیستەمی سەرمایەداری ئارەزوی زیاتر بکات لەکردنی هەموو شتێك بەکالایەك بۆ فرۆشتن و خەملاندنی مادی" بە پەیوەندی ژن بەمێرد و دایك بەمنداڵەکەیشییەوە.

لەپاڵ ئەمەدا کەکرێ دەدات بەئافرەت لەبری کارکردنی ناوماڵی وای لێدەکات کەنەچێتە دەرەوە بۆ کارکردن، لەئەنجامی ئەمەدا ئەوانەی لایەنگری ئەم بۆچوونەن لایان وایە کە ئەمە دابەشبوونی رەگەزی لەکارکردنا گەورەتر دەکات.

هەروەها فێمێنیزمە مارکسییەکان بەپلەی جیا لەڕاژەدا پابەندن بەخستنەڕوو و شیکردنەوەیان بۆ بابەتی چەوساندنەوەی





ئافرەت، ئەوان هێشتا هەر ئافرەتان هاندەدەن بۆ چوونە ناو بازاڕی کارەوە و بەلای ئەو بەرنامانەدا دەچن کەئامانجیان داڕمانی خێزانە بەو سیفەت و خەسڵەتەی کەیەکەیەکی ئابووریە و پشتی بینای سیستمی سەرمایەداری دەگرێت. ئەوان زیاتر لەهەموو رەوتێکی تری رەوتە فێمێنیزمەکان خۆشگوزەرانی ئابووری ئافرەت و سەربەخۆییان کردووە بەئامانج و خەمی خۆیان، لەپاڵ جەختکردنیان لەسەر گرێدانی شارەزایی ئافرەتان وەك کرێکار و بەنکردنیان لەناو خێزاندا. لەبەر ئەمە ئەو رەخنەیەی کەلەلایەن فێمێنیزمە غەیرە مارکسییەکانەوە بۆیان دەکرێت بەرادەیەکی بەرز پەیوەستە بەو تێزە یا نەوەیەوە کەداوای کرێ بۆ ئافرەت دەکات لەبری کاروباری ناو ماڵی. رەخنەیەکی تریشیان ئاراستە دەکرێت کە دەڵێت جەختکردن لەسەر سروشتی کاری ئافرەت و وەزیفەی بەتەنها هەرخۆی هاوبەش نییە لەزاڵبوون بەسەر چەوسانەوەیدا.

### ٣-فێمێنیزمی رادیکاڵی:

فێمێنیزمە مارکسییەکان رایان وایە فێمینیزمە لیبراڵی و و مارکسییەکان لەتیۆرکارییاندا نەگەیشتونەتە ئەو سنورەی کەشتەکانی تیا تەواو کرابێت.

بەلایانەوە سیستمی باوك سالاری سیستمێکە سیمای هێز و دەسەلات و چینگەری و کێبڕکێی پێوە دیارە" سیستمێکە چاناکرێت و نایەتە سەر سکەی راستی، بەلام دەکرێ بەتەواوی

لە ڕەگوڕیشەوە لەناوببرێت. فێمێنیزمە رادیکاڵەکان دەڵێن باوکسالاری سیستمی یاسایی یا دەزگای سیاسی نییە کەدەبێت قڵپبکرێتەوە و ژێر بخرێت، بەڵکو دەبێت باوکسالاری دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیش بگرێتەوە، بەتایبەتی سیستمی خێزان کەدەبێت هەڵبوەشێنرێتەوە.

هەندێك لەفێمێنیزمە رادیکاڵەکان لە تیۆرکارییاندا پشت بە پێکهاتەی جەستەیی دەبەستن کەلەلایەن ناحەزانی یەکسانی ئافرەت بەپیاوەوە بەکاردەهێنرێت، بەو پێیەی کەجەستەی ئافرەت نەگبەتی و ئایندەی نەگۆڕێتی. لەکاتێکدا هەندێکی تر جەخت لەسەر ئەو ڕێگایانە دەکەن کە بە هۆیانەوە چەمکی مێ / نێر (Female / Male) ئافرەت / پیاو (Woman / Man) بەکارهێنراوە ئەویش بۆ زەلیلکردنی ئافرەت و زاڵکردنی پیاو بەسەریا. بەدرێژایی مێژوو رای (Tong ١٩٩٢)[٤] وایە کەزۆر لەبیروبۆچوونی فێمێنیزمە رادیکاڵەکان هێشتا هەر لەیەك کاتدا بەسەر چەند ئاراستەیەکدا پەرەدەسێنێ. بۆیە پێویستە گفتوگۆکردن لەسەر ئەم بیروبۆچوونانە تەنها بەجەختکردنە سەر هەندێکیاندا کۆتاییبێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا بیروبۆچوونی فێمێنیزمە رادیکاڵەکان لەناو بیری فێمێنیزما بەقووڵترینیان دادەنرێت" چونکە ئەوان بۆ ئەوە دەچن چەوساندنەوەی ئافرەت کۆنترین و دیارترین شێوەی چەوساندنەوەیە. دەکرێ ئەم بۆچوونەیش بەم شێوەیە لێکبدرێتەوە:





- ئافرەتان لەمێژوودا یەکەم کۆمەڵن کەتووشی چەوساندنەوە دەبن.
- چەوساندنەوەی ئافرەتان زۆرترین شێوەی چەوساندنەوەیە کەلەناو کۆمەڵاندا بڵاوبۆتەوە.
- چەوساندنەوەی ئافرەتان قوڵترین و توندترین شێوەی چەوساندنەوەیە، و ناتوانرێت بەگۆڕینی کۆمەڵایەتی سووك لەناو ببرێت، وەك نمونەی زاڵبوون بەسەر سیستمی چینایەتیدا.
- چەوساندنەوەی ئافرەتان خراپترین وێنەی موعانات و ئازار–چەند و چۆن–بۆ قوربانیانی دەهێنێت. هەرچەندە دەکرێ ئەم موعاناتە هەبێت بێ تێبینیکردنی بەهۆی تەحەیوزی جنسی هەر یەك لەچەوسێنەر و قوربانی.
- چەوساندنەوەی ئافرەتان نمونەیەك پێشکەشدەکات بۆ گەیشتن لەشێوەکانی تری چەوساندنەوە.

جەختکردنی ئافرەتان و مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەو ڕەگەزانەی کەباسکران بەهەر شێوەیەك بێت، بەڵام نووسینی رادیکاڵی یەکێك یا زۆرتر لەو بابەتانە دەگرێ و باسیاندەکات کەتایبەتن بەمنداڵبوون و دایکایەتی و دابەشکردنی ڕەگەزیی نێرینە و مێینە و جنسیەتی ئافرەت. بۆیە هەوڵدان بۆ خستنەڕووی بیروبۆچوونی ئەم ڕەوتە دەبێت ئەم لایەنە سەرەکییانە

بگرێتەوە، چونکە فێمێنیزمە رادیکاڵەکان بایەخ بەو رێگایانە دەدەن کەبەهۆیانەوە پیاوان هەوڵیانداوە زاڵبن بەسەر جەستەی ئافرەتاندا. دەشێ ئەم کۆنترۆڵ کردنە بەهۆی کۆتکردنی بەربەستی سکپڕبوون و وەسیلەی نەزۆرککردن و ویاسای منداڵ لەباربردنەوە بێت، یاخود بەهۆی ئەو توندوتیژییەوە بێت کەئافرەتان دووچاری دەبن" وەك وێنەی رووت و پیا هەڵشاخانی سێکسی (تحرش جنسی) بەزۆر کونکردن و لێدان ئەو یارییەکی بەهێز و توند پێکدێنێت تا ئەو پلە و رادەیەی کە ئەنجامەکەی بەزەوتکردنی مافی ئافرەت کۆتایی دێت بۆ کۆنترۆڵکردنی جەستەی خۆی، پاشانیش مرۆڤایەتیش، هەروەها فێمێنیزمە رادیکاڵەکان باسی ئەو رێگایانە دەکەن کە بەهۆیانەوە پیاو جنسیەتی ئافرەتی پێکهێناوە بەو جۆرەی کەلە خزمەتکردنی پێداویستی و ئارەزووەکانیا بێت دوور لەرەچاوکردنی پێویستی و ئارەزوی ئافرەت.

فایرستۆن (Firestone ١٩٧٥) ئەوە رادەگەیەنێت پەترياركی، ئەو سیستمەی کەئافرەت ملکەچ دەکات رەگی خۆی لەنەبوونی یەکسانیی بیۆلۆجی نێوان هەردوو رەگەزەکە وەردەگرێ.

بۆیە بەپێچەوانەی مارکسیزم و مارکسییەکانەوە، وادەبینێت جیاوازی چینایەتی راستەقینە ئەوەیە کەلەنێوان پیاو و ئافرەتدا هەیە، پەیوەندی منداڵبوونیش نەك پەیوەندی بەرهەمهێنان، بەڵکو بزوێنەری سەرەکی مێژووە.





لەسەروی ئەمەیشەوە ئەگەر ویستمان لەهۆی ملکەچبوونی ئافرەتان بۆ پیاوان بگەین پێویستمان بەلێکدانەوەیەکی بیۆلۆجییە نەك لێکدانەوەی ئابووری، نەبوونی یەکسانی نێوان نێر و مێیش بەشێوەیەکی ساکار و رووکەش ناگەڕێتەوە بۆ جیاوازی بیۆلۆجی روون و ئاشکرا، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی بەینی رۆڵی پیاو و رۆڵی منداڵبوون لای ئافرەت کەبوو بەهۆی یەکەم دابەشبوونی کار بەشێوەیەك چیانایەتی لێکەوتەوە.

بۆیە (Firestone ١٩٧٠)° وادەبینێت چەوساندنەوەی ئافرەتان بۆ جیاوازی بیۆلۆجی دەگەڕێتەوە، رزگاربوونی ئافرەتیش شۆڕشێکی بیۆلۆجی دەوێت لەبەرامبەر ئەو شۆڕشە ئابوورییەی کەمارکسیزم بۆ نەهێشتنی چەوساندنەوەی کرێکاران پێشکەشیکرد. تەکنۆلۆجیا دەتوانێت ئەم شۆڕشە بکات بەشتێکی شیاو، چونکە گۆڕانکاریی تەکنۆلۆجی و رێکخستنی یاسایی" وەك دایکایەتی بەگرێبەستن، وای کرد کە بشێت ئەو ئافرەتەی منداڵی دەبێت ببێت بەغەیری ئەو ئافرەتەی کەسکی پڕ دەبێت، ئەو ئافرەتەی کەسکی پڕ دەبێت ببێت بە غەیری ئەو ئافرەتەی کەمنداڵ بەخێو دەکات.

لەپاڵ ئەمەشدا هەرچ کاتێك کرا هێلکۆکە و ئاوی تۆم کۆکرانەوە ئەویش بەمەبەستی منداڵبوون بەجەنین لەدەرەوەی رەحمدا ئەوە رۆڵی ئافرەت لەکاری زایندا لەو رۆڵە گەورەتر نابێت کەپیاو پێی هەڵئەسێت. ئافرەتان شلەکان دەبەخشنە ئەو

بانکانەی کەتایبەتن بەکاری کۆکردنەوەی هێکۆکە، هەروەها پیاوانیش ژیندارە تۆمدارەکان دەبەشخنە بانکی تایبەتی پاشان هەردوو رەگەزی نێر و مێ رزگار دەبن لەرۆڵی جۆراوجۆریان لەکاری منداڵبووندا، ئەمەیش بۆخۆی هەموو رۆڵێکی رەگەزی کەمدەکاتەوە.

پەیوەستبوونی ئافرەتان بەکاری زاینەوە کار ئاسانی بۆ کۆمەڵگا کردووە چوارچێوە بۆ ئافرەت دابنێت و بیبەستێت بە چوارچێوەی تایبەتی ناوماڵەوە، لەهەمان کاتدا پیاوان بنێرنرێن بۆ بازاڕی کار یا چوارچێوەی گشتی. لەبەرئەوە وەختێك ئافرەتان لەزاین و سەرفکردنی ئەوەی سیستمی سەرمایەداری بەرهەمیدێنێت، دەکەون ئیتر هۆی مەنتیقی ئەقلانی نامێنێت بۆ پاراستن و هێلانەوەیان لەماڵدا، بەمەیش خێزان وەك یەکەیەکی ئابوری کۆتاییدێت.

چەمکی دایکایەتی بیۆلۆجی ملی بۆ رەخنەی زۆر نا، نەك تەنها لەلایەن بزوتنەوەکانی فێمێنیزم بەهەموو رەوتەکانییەوە بەڵکو لەلایەن فێمێنیزمە رادیکاڵەکان خۆیشیانەوە.

لەو رەخنانە تێزەکانی ئۆکلییە ( Oakle ١٩٧٤ ) کەوا دەبینێت دایکایەتی تەنها وەهمێکە خەرافەیە لەسەر هەموو ئاستەکانی، وەك ئەو وتەیەی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەئافرەتان هەموویان پێویستیان بەهەستکردنە بەدایکایەتی، دایکان هەموو پێویستیان بەمنداڵەکانیانە، منداڵانیش هەموو پێویستیان بەدایکیانە.





سەبارەت بەجەخکردنی یەکەم کە دەڵێ ئافرەتان هەموویان پێویستیان بەوەیە ببن بەدایك، راستیی خۆی، وەك ( Oakle ١٩٧٤) دەڵێت، لەو رێگایەوە وەرگرتووە کە کچی پێ پەروەردە و گەورە دەکرێت ئەگەر باوك و دایك بوو کەشووشە نەدەن بەکچان، ئەگەر قوتابخانە و راگەیاندن یا کۆمەڵ جەخت لەسەر سەیر و عەجیبی دایکایەتی نەکەن، ئەگەر زانایان و پزیشکانی دەروونناسی هەڵنەسن بەکردنی کچی (حەز بەسروشتی پیاو کردوو) کە مەیلی لەدایکایەتی نییە، بە کچی (مێ) کەحەز لەدایکایەتی دەکات، ئەوە ژمارەیەکی کەم لەکچان پێدەگەن ئارەزوویان دەبێ ببن بەدایك لەپێناوی ئەوەی هەستکردنیان بەنرخی خود تیا دروست ببێت ئۆکرەی وادەبینێ کە ئافرەت مانای ئەوە نییە بۆ ئارەزووکردن لە دایکایەتی خاوەنی هێلکۆکە و منداڵدانە، بەڵکو کێشەکە لەو چۆنێتییەدا کۆدەبێتەوەو کە ئافرەتی لەرووی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەوە پێیپەروەردە دەکرێت تا ببێت بە دایك.

هەروەها وتنی ئەوەی دایکان پێویستیان بە منداڵە—وتەیەکە لەسەر ئەو باوەڕە دروستبووە کەئافرەت تووشی بیئومێدی دەبێت ئەگەر غەریزەی دایکایەتی تیا تێرنەکرێت (Oakle ١٩٧٨) رادەگۆڕێتەوە و دەڵێ شتێك نییە پێی بوترێت غەریزەی دایکایەتی، جا ئەگەر ئەوە بگەیەنێت کەئافرەتان (سروشتیەکان) ئارەزوویان لەمناڵ خستنەوە هەیە، یا ئەو

ئارەزوەیان هەر لەکاتی سکپڕی و منداڵبووندا یاخود دوای ئەوە هەبێت.

بەڵام سەبارەت بەوەی کە لکاوە بەو ئاستەی پەیوەندی بەو باوەڕەوە هەیە کە دەڵێت" منداڵ هەمویان پێویستیان بە دایکانیانە ئەوە (Oaklex) باوەڕی بەوەیە کەئەم ئاستە خەرافیترین و ستەمدارترین وێنەی پەیوەندیدار بە دایکایەتی بیۆلۆجییەوە بەکاردەهێنێت، چونکە ئەم ئاستە سێ گریمانی تیایە کە بەشێوەیەکی ناپێویست ئافرەت دەبەستێت بە منداڵەوە" یەکەمیان ئەو مانایەیە بەدەوری ئەو وتەیەدا دەسوڕێتەوە کە دەڵێت" منداڵان پێویستیان بەدایکانی بیولۆجی هەیە نەک کۆمەڵایەتی. دووەمیش ئەو مانایە هەڵدەگرێ کە دەڵێت" منداڵان پێویستیان بەچاودێری و سەرپەرشتی و بایەخدانی چڕی دایکە نەک باوک. سێیەمیشیان ئەوەیە کە دەڵێ منداڵان پێویستیان بە پەروەردە و بایەخی تاکە بەخێوکەرێکە و بەس، چاکترە دایکی بیولۆچی بێت. لەدەمەتەقێکەیدا بەردەوامدەبێت و دەڵێت ئەم هەموو گریمانانە راستنین. چالاکی دایکێک "دایە" تینی لەچالاکی دایکی سروشتی کەمتر نییە، هەروەها منداڵان پێویستیان بەدایکان نییە زیاتر لەپێویستییان بۆ باوکیان" منداڵ پێویستی بەکەسێکە پەیوەندییەکی راستەقینە و گەرمی لەگەڵ ببەستێت، دەتوانێت پشتی پێببەستێت و لەکاتی تەنگانە و پێویستییا لەگەڵی بێت. ئیتر گرنگ و مەرج نییە ئەو کەسە دایک بێت یان





باوک، هەروەها پەیوەندی دایکایەتیدوو لایەنە (دایک / منداڵ) لەپەیوەندی دایکاتی فرە لایەن چاکتر نییە. وەک چۆن ئەمە لەگەڵ منداڵانی کیبۆتسی ئیسرائیلیدا بەکاردەهێنرێت، ئافرەتانی کۆمەڵی کیبوتس پەیوەندی دایکایەتی لەگەڵ منداڵاندا. بەشێوەیەکی کۆمەڵی و بەهاوبەشی ئەو دایکانە دەبەستن کە لەکیبوتسدان، ئەم پەیوەندییەیش هیچ پاشماوەی خراپی نەخستۆتەوە، منداڵانی کیبوتس لەزەکاوەت و گونجان و راهاتن و بەختەوەریدا لەمنداڵانی تر کەمتر نین.

خەرافەتی دایکی بیۆلۆچی-وەک (Oaklex) دەیبینێ-لەڕووی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەوە بۆ ئامانجی چەوسێنەرانە دامەزراوە. لەبەرئەوە ترسی ئافرەتان لەوەی بەناسروشتی و خۆپەرستی لەقەڵەم نەدرێن ئەو ئافرەتانەیشی کەحەز لەمنداڵبوون ناکەن کردووە بەدایک، ئەو دایکانەیش کەخۆشی و راحەت لەبەشداری کەسانی دی دەبینن لەبەخێوکردنی منداڵەکانیاندا دایکایەتییان کردووە بە ئەرکێک و وەزیفەیەک بەدرێژایی کاتژمێر و رۆژ ئەنجامدەدرێت.

لەبەر ئەمە زۆر لەئافرەتان وایان لێهاتووە بەدایکایەتی بەختەوەرنین.

فێمێنیزمی رادیکاڵی وادەبینێن ئارەزووکردن لەمنداڵبوون و پەروەردەکردن تەنها ئەنجامێکە بۆ ئارەزووکردن لەپەیداکردنی پەیوەندی پتەو و پێویستی بۆ بەردەوامبوونی خود. منداڵ بۆ پیاو نەمرکردنی ناوێتی نەمرکردنی موڵک و چین و شوناسی

نەتەوەیەتییەتی. منداڵ بۆ ئافرەتیش بەهانەیە بۆ گرنگی و پێویستی بوونی. بۆیە ئەگەر تاکەکان ڕێگای جۆراوجۆریان بۆ تێرکردنی خودی خۆیان هەبێت ئەوکاتە بۆیان دەرئەکەوێ پێویستیان بەوە نابێت ببن بەدایك و باوکی بیۆلۆجی.

فێمیمێنیزمە رادیکاڵییەکان لەڕێگای تیۆرکارییانەوە شتگەلێکی وا دەخەنەڕوو کە دەبنە هۆی رزگارکردنی ئافرەتان لەقەفەزی ئافرەتگەری.

ئەم ڕێگایانەیش لەناو کارکردن بەرەو ڕۆشنبیرییەکی نێرەمۆکانەی بێلایەندا دەگۆڕێ و جیاواز دەکەوێتەوە" بەهۆیەوە جیاوازی نێوان نێر و مێ کەمدەبێتەوە تاکو جێگای ڕۆشنبیری نێرانە و ڕۆشنبیری مێیانە بگرێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی تیۆرکاریی فێمێنیزمی رادیکاڵی لەڕەوتی فێمێیزمی تر بەو وردەکارایانە جیادەبێتەوە کەدەربارەی ئەو ڕێگایانە دەیانخاتەڕوو کەبەهۆیانەوە پیاوان، نەك کۆمەڵ و بارو دۆخ هەڵئەسن بەسەپاندنی ڕۆڵ و هەڵسوکەوتی سێکسی زۆردار بەسەر ئافرەتاندا.

میلیت (Millett ١٩٧٠)[٧] بەپێشەنگەکانی ئەو فێمێنیزمە رادیکاڵیانە دادەنرێت کە جەخت لەسەر پەیوەندی پەترایکی بەچەوساندنەوەی ئافرەتانەوە دەکەنەوە. لەکتێبەکەیدا، (Sexual Politics) بۆ ئەوە دەچێت پەیوەندی سێکسی پێش هەموو شتێك پەیوەندییەکی سیاسییانەیە.





پەیوەندی پیاو بەئافرەتەوە نموونەیەکە بۆ هەموو پەیوەندییەکانی هێز، زاڵبوونی پیاویش بەسەر هەردوو جیهانی تایبەتی و گشتی لەکۆمەڵدا بۆ خۆی بنەماکانی پەتریارکی پێکدەهێنێ.

لەبەرئەوە پێویستە لەم دەسەڵاتە کەمبکرێتەوە ئەگەر ویسترا ئافرەتان رزگاریان ببێت.

بەپێی بۆچوونی (Millett ١٩٧٠) چەمکی پەتریارکی لەسەر زەقکردنی جیاوازی بیۆلۆجی نێوان پیاو و ژن و زلکردنی لەپێناوی زامنکردنی ئەوەی ڕۆڵی نێرینە و بەدەسەڵاتدار بەشی پیاو بێت، ڕۆڵی مێینە و چەوسێنراویش بەشی ژن بێت بەرزبۆتەوە بۆ ئەوەی پەتریارکی ئەم پایە بڵندە بۆ خۆی زامنکات دەست بەسەر دەزگا کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییە سەرەکییەکانی ناو کۆمەڵدا دەگرێت" وەك خێزان و قوتابخانە ئەم دەزگایانەیش لەڕێگای خۆیانەوە جەخت لەسەر پاشکۆیی ئافرەت بۆ پیاو و هەستکردن بەلاوازی و نزمییان بۆ پیاو دە کەن. توقاندن شێواز و سیمایەکە لەسیماکانی پەتریارکی.

لای فێمێنیزمە رادیکاڵەکان پەتریارکی نموونە بۆ هەموو شێوەکانی چەوساندنەوە پێکدەهێنێ، بەهەمان حاڵیش سەبارەت بەجیاوازی ڕەگەزی و سەرخستنی بەهێزەکەیان کەپێش هەموو شێوەکانی جیاوازی کەوتووە بەجیاوازی چینایەتی و نەتەوەییشەوە.

فێمێنیزمە رادیکاڵەکان وادەبینن زاڵبوونی پیاو بەسەر ئافرەتدا بواری بۆ چەندین نموونە و وێنەی یەك لەدوای یەکی دەسەڵات کردۆتەوە" بۆیە ئەگەر توانیمان بیانو بۆ ملکەچی ئافرەت بۆ پیاو بهێنینەوە ئەوە دەتوانین بیانو بۆ نمونەکانی تری ملکەچی و دەسەڵات بهێنینەوە. لەبەرئەوەیش کە دەسەڵات و کۆنترۆڵکردن سیمای پەتریارکی و گوناهکایەتی بەهەموو وێنە و ئاستەکانییەوە بۆیە فێمێنیزمە رادیکاڵەکان جەختیان لەسەر شیکردنەوەی دەستوور و رەگەکانی کردەوە.

لەزەمانی کۆندا مرۆڤ بەئاشتی و تەبایی لەگەڵ سروشتدا ژیاوە، خۆیشی بە بەشێك لە (گشت) زانیوە، پێویستە رابێت لەگەڵیا لە پێناوی بەردەوامبوون لەژیاندا. بەپێی ئەو دەلیل و سەلمێنراوانەی کە لەبەردەستان فێمێنیزمە رادیکاڵەکان باوەڕیان بەوەیە کە کۆمەڵگای کۆن دایکسالاری بوبێت، چونکە دایك رۆڵی سەرەکی لەژیانی کۆمەڵدا بینووە بەو پەیوەندی و بەشداربوونە تەباو هاوڕێتمانەی کە لەگەڵ سروشتدا بەستوویەتی. سروشت هاوڕێ و دۆست بووە، ئافرەتیش بەو پێیەی پارێزگاری ژیانی کردووە و بەرپرس بووە لەبەردەوامبوونی (لەڕێگای منداڵبوون و زاوزێوە) هەر دۆست و هاوڕێ بووە. بەهۆی زیادبوونی بەشەرەوە سروشت ئەو توانایەی نەما پێویستییەکانی لەخواردن بۆ دابینبکات. ئەوەی لەراو دەستیدەکەوت یا کۆیدەکردەوە کەم بوو، بۆیە سروشت وەك هاوڕێ بەخشندەکەی جاران سەیرنەدەکرا بەڵکو بوو بە





دوژمنێکی سەرسەخت. وایلێهات پێویست بوو کەسروشت هەڵبکەندرێ، بکێڵرێ و بتەقێنرێتەوە بۆ دەرکردنی ئەو شتانەی لەمرۆڤی دەشاردەوە. بەم پێیە مرۆ جڵەوی کارەکانی گرتە دەست، کەوتە سەرپەرەپێدانی ئەو تەکنیکانەی کەیارمەتیدەدەن بۆ رزگارکردنی خۆی لەئارەزووەکانی سروشت و هێز و دەسەڵاتی.

چەند دەسەڵاتی بەشەر بەسەر سروشتدا بشکایەتەوە زیاتر لێی دووردەکەوتەوە و زیاتر لەڕوی مەعنەوی و جەستەوە لێی وەدووردەکەوت. فرنچ (French ١٩٨٥)[٨] پێی وایە چەند مرۆڤ و سروشت بەهۆی دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەریا لەیەکتر دووربکەونەوە زیاتر مرۆڤ بەسروشت نامۆ دەبێت. لێرەدا نامۆبوون مانای هەستکردنێکی بەهێز و توند بەسەربەخۆیی دەگەیەنێت، سەربەخۆیی تا رادەی دژایەتی کەترسێکی لێدەبێتەوە پاشانیش دەبێت بە دوژمنایەتی. بۆیە شتێکی نامۆ نییە ئەم هەستە سلبییانە ببن بەهۆی قوڵکردنی ئارەزوی پیاو بۆ زاڵبوون نەك تەنها بەسەر سروشتدا، بەڵکو بەسەر ئافرەتیشا، کەبەهۆی توانای زایینیەوە لکاوە بەسروشتەوە.

پەتریارکی وەك سیستمێکی چینایەتی لەدایکبوو، وەك سیستمێك نرخ و بەهای توانای بەسەر کەسانی تردا پەخشدەکردەوە بەهۆی ئارەزووی پیاو بۆ زاڵبوون بەسەر ژن و سروشتدا کەلایەنی کێشەکە بوون. ئەم نرخ و بەهایە واتای دەسەڵاتی دانەری یاسای دەبەخشی، واتە گەورە و لێپرسراوی

یە کەم. لەبەرئەمە فێمێنیزمە رادیکاڵەکان پێیان وایە باشترین نموونە بۆ کۆمەڵگاکان کۆمەڵگای نێرە مووکە کەنرخ بۆ سیمای مێژوویی مێینە وەك (خۆشەویستی و سۆز) دائەنێ بەو شێوەی کەنرخی بۆ سیما نێرینەکانی وەك ئارەزوکردن لەدەسەلآت و موڵکدارێتی دائەنێ .

چەمکی سێکسگەری ئافرەت (Female Sexualix) لەچەمکە سەرەکییە حەساسەکانی تیۆرکاری فێمێنیزم بەگشتی دائەنرێت. لەبەرئەمە رادیکاڵەکان وادەبینن کە بەهەمان پلە کەچوارچێوەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری هەردوو چەمکی مێگەری و نێرگەری پێ پێکهێناوە، توانای مناڵبوونیش لای ئافرەتیش شوناس و هەڵسوکەوتی پێکهێناوە، بۆیە لەژێر سێبەری تەوەقوعی کۆمەڵایەتی گرفتاریشدا بۆ ئافرەت گران بووە ئارەزوو و پێویستی سێکسی خۆی بناسێتەوە. گرنگیی ئەم چەمکەیش لەباوەڕی فێمێنیزمە رادیکاڵەکانەوە هەڵقوڵاوە گوایە توندوتیژی ئاتاج بەدەسەلآت نمونەی جنسیەتی پیاوی (Male Sexualix) پێکهێناوە کە بەرەفتارێکی پەسەند و سروشتی دانراوە. بۆیە توندوتیژی سێکسیش دژی ئافرەتان بووە بەسروشتی پەسەندکراو لەپەیوەندی سێکسیدا لەخیلالی گریمانی ئەوەی پیاو هەر بۆ خۆی و لەسروشتی خۆیەوە شەڕخواز و دەسەلآتدارە کاتێك کە هەڵوێستەکە پەیوەندی بەسێکسەوە دەبێ، بەلآم سروشتی ئافرەتیش، لەهەمان هەڵوێستدا، سلبی و ملکەچە (مستسلم). لەبەرئەوەی کە





دەسەلآتداری پیاو و ملکەچیی ئافرەت یاسایە لەهەڵوێستە بنەڕەتییەکانی وەك سێکسیدا، ئەوە لەهەڵوێستەکانی تریشدا بووە بەیاسا و دەستوور.

هەرچەندە فێمێنیزمە رادیکاڵەکان لەلایەن کۆمەڵی فێمێنیزمییەوە رێزیان لێدەگیرێ، بەلآم رەوتەکانی تری ئافرەتگەری رەخنە و بۆچوونی خۆیان لەسەریان هەیە. لەم رەخنانەیشیان ئەوەیە کە فێمێنیزمی رادیکالی ئامادەگی بیۆلۆجی ئافرەتان وەك شتێکی نەگۆڕ و دوور لەگۆڕان دادەنێن (وەك چۆن لەپێشدا رەخنەی "Oaklex ١٩٧٠"مان خستەڕوو)، چونکە پێکهاتەی بیۆلۆجی تەفاعول لەگەڵ ئەوهێزی دەورووبەرە دەکات کە مامەڵەی لەگەڵ دەکات..پاشان بچوکی جەستەی ئافرەت و لاوازیی بۆ نزمیی پایەی ئافرەت لەکۆمەڵدا دەگەڕێتەوە، ئەوەی کەبەهۆیەوە ئافرەت سیستمێکی خواردنی هەژارتری لەهی پیاو بەرکەوت. قەبارەی ئافرەت لەهی پیاو بچوکترە ئەمیش نەك بەهۆی سروشتی بیۆلۆجی جەستەیەوە، بەڵکو لەئەنجامی ئەو چوارچێوە رۆشنبیرییە کۆمەڵایەتییانەوە کە لەمێژوودا ئافرەت پێیان ژیاوە. جگە لەمە پێکهاتەی بیۆلۆجی تەنها تاکێکە لەو گشتەی شوناسی ئافرەت دیاریدەکات.

رەخنەی مێینیزمە لیبڕاڵەکان لەچەمکی بیۆلۆجیدا کۆنەبووەوە بەڵکو فراوانبووەوە تائەو راو شیکردنەوانەیش بگرێتەوە کە دەربارەی پەیوەندی سیستمی پەتریارکین لەمەڕ

چەوساندنەوەی ئافرەت. ئەم ڕەخنەیەیش لەسەر ئەو بنەمایەیە کەئەوە ڕووندەکاتەوە رادیکاڵەکان لەتیۆرکارییاندا دەربارەی ژیان لەسەدەی نۆزدە تێنەپەڕیون وەختێك پیاوان ئافرەتانیان لەبورجی دوور لەسیاسەت وئابوری دا بەند کردووە .هەرچەندە ئەم ڕەخنەیە دان بەوەدا دەنێ کە پاتریارکی کەرەستەیەکی بەکارە لەکەرەستەکانی شیکردنەوەی ئەو ئافرەتانەی کەدەست بەدروستکردنەوەی بنیاتی چەمکی سیاسی و کەسێتییان لەسەر شارە زایەکانیان دەکەنەوە ،بەڵام بەتر یارکی هەر وەك چەمکێکی بەستوی هەموو هەولێکی شیکاری قوڵتر دەمێنێتەوە.

## ڕەوتی فێمینیزمی سایکۆلۆژی:

لەگەڵ ئەو ڕەخنانەداکە فێمینیزم ئاڕاستەی ڕاکانی "سیگمۆند فرۆید"یان کردووە، بەتایبەت دەربارەی ئەو بازنەیەی کە پەیوەستە بە هەست کردنی کچ بەنزمی لەبەر نەبونی ئەندامی نێرینە بۆ زاووزێکردن لەلای ئەم، کەلەدواییدا بۆخۆی بالأدەستی دەبەخشێتە نێر، ئەو نوسینانەی کەپەیوەستن بەجنسیەتی مێ لەلایەن فێمینیزمەکانی _شیکردنەوەی دەرونی _یەوە شیاوی جەختلەسەرکردن وبایەخپێدانن، ئەوانیش لەبەر توانای بەدیهێنانی ڕزگاری بۆ ئافرەت.

لەمێژوی فێمینیزمی شیکردنەوەی دەرونیدا pyschoanalxtecfeminism چوار ڕەوت لەم ئاڕاستەدا





پەرەیانسەند. هەر ڕەو تێکیش کەدەر کەوتووە هەوڵیداوە پەرە بەبنە ماکانی فروێدیزم بۆ ئاڕاستە فێمینیزمەکان بدات ڕەوتی یەکەم هەوڵیداوەفرۆیدیزم لەهە موو نیشانە بیۆلۆ جییەکان پاکبکاتەوە. ڕەوتی دوەمیش هیچ بایەخێکی بەگرێی ئۆدیب نەدا، بەڵکو بایەخی بەپێش ئۆدیبیدا واتە ئەو ماوەیەی کەپەیوەندی دایك بەکوڕەکە یەوە دەبەستێت. بەلأم ڕەوتی سێیەم بایەخی خۆی ئاڕاستەی خاڵی بەهێزی هەڵسوکەوتی ئەخلاقی ئافرەت کرد زیاتر لەو خاڵە لاوازانەی کە فرۆید جەختی لەسەر دەکردن _ڕەوتی چوارەمیش هەوڵیدا کەسەر لەنوێ گرێی ئۆدیب ڕاڤە بکاتەوە لەڕێگای ئەوەی چەند مانایەکی نوێی دوور لەپاتریارکی بداتێ .هەموو ئەم ڕەوتانەی _فێمینیزمی _شیکردنەوەی دەروونی _ئەوە دەردەخەن کە ڕەنگە تیۆرکاری فروێدی چەمکی ڕزگارکەری بۆئافرەت پێبێت لەهەمان کاتدا چەمکی چەو سێنەریشی بۆ هەیە.ئەو بۆچونانەی فرۆید لەمەڕسروشتی ئافرەت فێمینیزمەکان زۆر توڕە دەکات .بۆیە نیشانەی یەکەمی کۆمەڵی یەکەم کەلەشیکاری فێمێنیزمەکان کەوتەوە ڕەتکردنەوەی ڕاو بۆچونەکانی فرۆیدی دەربارەی دەستنیشانکەرە بییۆ لۆجییەکان زەقکردەوە، لەبەرامبەریدا داکۆکییان لەڕۆڵی ڕۆشنبیریو واقیعی لە پێکهاتنی شوناسی ئافرەت وڕەفتاری مێینە دەکرد.

مێینیزمەکانی_شیکردنەوەی دەروونی دەڵێن بنەمای بێۆلۆجی تاك یان "خیبرە" لەڕوی مەنتیقییەوە _وە بەو شێوەیەی کە ناتوانرێ لەناو ببرێ_نابێتە مایەی دروستکردنی سیمای سایکۆلۆجی دیاریکراو یاشارەزایی ئایندەیی .ئەم ڕەوتە بۆئەوە دەچێت کەهەر یەکە لە ئێمە خودێکی داهێنەری هەیەدەکەوێتە بەینی دیاری کەرە بایۆلۆجیەکانەوە و بەکۆمەڵێك ئامانج و ئاواتەوە بۆئایندە، لێی دەرئەچێ.بۆیە هەروەك خاوەنەکانی ئەم ڕەوتە بەدوایدا دەچن ،ئەوەی کەژیانمان پێکدەهێنێ و دەستنیشانی دەکات بۆچونمانە لەمەڕ ئایندە نەك ڕەگ و ڕیشەی ڕابردومان .جگە لەو ڕۆڵە گەورەیەی کەکەدەوروبەر لەنەشونماکردن وگەینی مێ ونێردا دەیبینێ، بۆیە بەنزمزانینی ئافرەت لە(دەسەڵاتی جەستەیی نێرینەوە) سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو پەیوەستە بەدەرککردنی ئافرەت بۆ ڕاستی بارو دۆخی ملکەچی خۆی بۆپیاو. بەم شێوەیە ئارەزوکردنی ئافرەتان لەوەی ببن بەپیاو بەهۆی پلەو پایەو دەسەڵات وزاڵبونییەوە یە بەسەر کۆمەڵگادا ،نەك بەهۆی ئەوەوە عەشقی ئەندامی نێرینەی بێت وەك چۆن شیکردنەوەی فرۆیدی بۆی دەچێت.

مێینیزمەکانی _شیکردنەوەی دەروونی وادەبینن پەیوەندی منداڵ (کچ یا کوڕ) بەدایکییەوە لەبنەڕەتدا هاوسان و تەواونیە، چونکە منداڵ و کچ یاکوڕ توانای ئەوەی نیە جیاوازی لەنێوان خودو دایکدا بکات. ڕەچاوی ئەوەش دەکرێت کەجەستەی





مادی یەکەم پەیوەندی مادی، یان جەستەییە منداڵ هەستیپێدەکات و لەگەڵی دەژی.ئەم شارەزاییە بۆمنداڵ هێمای جیهانێك دروستدەکات کەناتوانرێ پشتی پێببەسترێ یانوقلاڵنەی پێ لێبدرێ.

دایك سەرچاوەی چێژو ئازارە بۆئەو منداڵەی کەدڵنیا نابێت لەوەی کەپێویستیە مادی و دەروونیەکانی تێر دەبن ،چونکە دایك چۆن لەهەندێك کاتدا بەخشندە دەبێت لەهەندێك کاتی تریشدا بەخشندەیی کەمدەبێتەوە .لەئەنجامی ئەمەدا منداڵ و گەورە دەبێت وهەستێکی ناڕێکی دەبێت و لەگەڵیا گەورە دەبێت سەبارەت بەشێوەی دایك (ئافرەت) کەنوێنەرایەتی گشتێکی بۆدەکات لەجیهانی مادی ،جەستەییدا کە ئەوە ڕەتدەکاتەوە جارێکی تر لەژێر پشتبەستن بەهێزی لەگەڵیدا بژی. بۆیەپیاو بەو ئاڕاستەدا دەچێت زاڵبێت بەسەر ئافرەت و سروشتدا و بەهی خۆیانی بزانێت و هەروەها ترسی منداڵی کچیش لە هێزی دایك پاڵ بە ژنەوە دەنێت لەژێر دەسەڵاتی پیاودا بێت .بەم شێوەیە پیاوان پێویستییان بەوە دەبێت دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئافرەتاندا بنوێنن ،ئافرەتانیش پێویستیان بەوە دەبێت پیاوان زاڵبن بەسەریاندائەمەش دەبێتە هۆی دروستبونی سیستمێکی جنسی شێواو و وەك نمونەی پەیوەندی جنسی ڕو خێنەر کاردەکات .مێینیزمەکانی _شیکردنەوەی دەرونی دەڵێن ئافرەتان ئەوە پە سەندەکەن موڵکی جنسی پیاوان بن بەو سیفەتەی کەئەوە مافێکی پیاوان

خۆیانە لەهەمان کاتدا ئەم مافە بۆ خۆیان بەرەوانابینن چونکە ئافرەت لەو هێزی دایکایەتییە دەترسێت کەلەناخیایەتی و وا یلێدەکات بەدوای پیاوێکدا بگەرێت کەپێویستی بەم بێت ،ئەویش ئەو پیاوەیە ئەمی ئافرەت داگیردەکات .چەندێکیش پێویستی پیاوەکە بۆ ئافرەتەکە لەزیادبوندا بێت ئەوەندەیش ئارەزووی ئافرەتەکە بۆ مانەوە لەگەڵ پیاوەکەدا زیاد دەکات .بەڵام لەبەر ئەوەی پیاو دەوری دایك بۆ ئافرەت نابینێ بەو شێوەیەی کەئافرەتەکە بۆپیاوەکە ی دەبینێ ، بۆیە ئەو بەشەی لەلا نابێت کەپاڵ بە پیاوەوە دەنێت بۆ موڵکایەتی کردنی دایك .پاشان قووڵیئەوبەیەکەوەژیانە گرنگی نابێت کە ژنە لەگەڵ پیاودابەدیدەهێنێ ئەو بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەوەدا یەکسان نابێت کەبۆ ئافرەت دەشێ لەگەڵ دایکا بەدیبهێنێ. دوای ئەوە کاتێك کەپیاو واز لەژن دەهێنێ ئەم هەست بەو چەشنەخەمە ناکات کەلەو کاتەدا هەستیپێکردو تووشی بووکەدایکی وازی لێهێنا.

قۆناغی پێش ئۆدیبی بەگرێی ئۆدیبی کۆتایی دێت ،کوڕ واز لەیەکەم شت دێنێ کەحەزی لێکردووە ، لەئەنجامی دابەزینی لەئارەزووەکانی لەپێناوی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی دا کوڕبەتەواوی لەگەڵ ڕۆشنبیریدەورو بەری خۆیدا دەگونجێنێت ولەگەڵ بابی ڕێك و تەبادەبێت ،دەسەڵاتی خۆی بەسەر ژن ،و سروشتدا پیادە دەکات کەبۆ ئەم نوێنەرایەتی هێزی غەیرە ئاقڵ دەکات .بەپێچەوانەی کوڕیشەوە کچ لەیەکەم شت





جیادەبێتەوە کە حەزی لێکردووە ،بەهۆی نەبونی ئەندامی مێینە لەلای تێکەڵاوبوون وگونجانی لەگەڵ ڕۆشنبیریدا نوقسان دەر ئەچێ وپەراوێز دەخرێت بەوسیفەتەی کەفرمان ئاڕاستە ناکات بەڵکو وەرێدەگرێ ئەویش بەهۆی ئەو هێزەوەی کە لەگەڵ خۆیدا هەڵیدەگرێ .

هەروەها فێمنیزمەکانی _شیکردنەوەی دەرونی وادە بینن پاتریارکی یا دەسەڵاتی نێر ڕەگەکانی خۆی لەگرێی ئۆدیبی وەردەگرێ، بەڵام ئەمە مانای ڕەتکردنەوە ی ئەم قۆناغە ناگەیەنێت بەتەواوی ،بەتایبەتی ئەم نوێنەرایەتی ئەوە دەکات کەتاك وەختی لکانی بەکۆمەڵەوە لەگەڵیا دەیگو زەرێنێ.قایلبونی مێینیزمەکانی _شیکردنەوەی دەروونی بەلایەنێك لەئۆدیبی مەعنای ئەوە ناگەیەنێت کەشیکردنەوەی فرۆیدی پەسە ندەکەن کە دەسەڵات و سەربەخۆیی و جیهانخوازی کردووە بەخەسڵەتی نێرینە وسۆز و پشتبەستن بەکەسی تر نەك (بەخۆ)ی و تایبەتمەندی کردووە بەسیماو خەسڵەتی مێینە ،ئەمەی کە مێینیزمەکانی _شیکردنەوەی دەرونی ، بە بەشێکی بنەڕەتی نابینن لەئۆدیبییا .بەڵام ئەم خەسڵەتانە بەساکاری بریتین لەئەنجامی سروشتی خیبرەی بژێوی وژیانی منداڵان لەگەڵ ژن و پیاودا .لەبەر ئەمە هاوکاری باوك ودایك.

لەپرۆسەی پەروەردەو بەشداربونی پێکەوەییان (جوتییان) لەبازاڕی کاردا یەکسانی وهاوکوفی جنسی (پیاو/ژن) ئۆدیبی

دەگۆڕێت بەم جۆرە دەسەلآت وسەربەخۆیی و جیهانگیری نابن بەموڵکی پیاو،خۆشەویستی و سۆزو تایبەتمەندی نابن بە هەرتەنها موڵکی ئافرەت.هەروەها فیمینیزمەکانی- شیکردنەوەی دەروونی —ئەو بۆچونانەی فرۆید ڕتدەکەنەوە کەدەلیٚ پیاو تواناى تێگەیشتنی ڕوونیان بۆ داد پەروەری هەیە بەوسیفەتەی کەچەمکێکی ئەخلاقیە،لەکاتێدا کەئافرەتان ئەم توانایەیان نییە.ئەم فێمنیزمانە لەبەرانبەر ئەوەدا ئەو ڕایەی خۆیان دەخەنە ڕوو کەدەڵیٚ ژن و پیاوچەمکی ئەخلاقی جیاوازو جۆراو جۆریان لەلایە، کە هەموویان بەیەکەوە لکاون و مەنتیقی و ڕەوان .چونکە جیاوازن و خیبرە لەنێوان پیاوان و ئافرەتاندا وا لە ئەخلاقی پیاودەکات بەدەوری چەمکی داد پەروەری و یەکسانی و سەرکردایەتی و مافدا بسوڕێتەوە. لەکاتێکدا کەشارەزایی ئافرەتان کەپەیوەستە بەخێزانەوە جەخت لەسەر ئەو ئەخلاقە دەکات کە بەدەوری پێویستیە کانی بەشەر و بایەخەکانیاندا دەسوڕێتەوە.بەلآم داشکانی تیۆرە فەلسەفی و سایکۆلۆجییەکان بەلای ئەمە و ئەوەدا بۆخۆیەتی ئەخلاقی پیاوی بەڕەوا زانیوە و سیفەتی کەمی و لاوازیشی بەئافرەت بەخشیوە.ڕەنگە ئافرەتان لەنووسینەکانی فیمینیزمەکانی _شیکردنەوەی دەروونیدا_شیکردنەوەی سەلمێنەر ببینن لەمەڕ پێویستی ئافرەت بۆ خۆشەویستی و ئارەزووکردنی لەوازهێنان لەپلەو پایەیەکی وەزیفی لە پێناو چەشوەرگرتن لەژیانێکی خێزانی گەرم و گوڕ،هەروەها بۆئامادەگی لێبوردنی لەپیاو





لەسەر ڕەفتاری خراپ لەگەڵ ئافرەتداولەبیر کردن و پەڕاوێز خستنیشی لەلایەن پیاوەو.بەلآم فیمینزمەکانی _شیکردنەوەی دەروونی تەفسیرێکی تەواویان بۆ بەنزم زانینی میٚ لەسەر یاسایی و سیاسی وئابوری لانیە.لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە ڕزگارکردنی ئافرەت لەهەموو بەربەستێك لەبەردەم ئاستی پێشکەوتنیا داوای گەڕانی لێبکات بەدوای هەموو مافەکانیا نەك تەنها هەر مافە مەدەنیەکان.لەکۆی ئەو ڕەخنانەی کەئاڕاستەی ئەم ڕەوگەیە دەکرێت ئەوەیە کەفیمینزمەکانی شیکردنەوەی دەروونی _تەواو وەك فێمینیزمە ڕادیکاڵەکان شیکردنەوەو تەفسیرگەلێك پێشکەش دەکەن کەمۆرکێکی گشتگیریان پێوەیە بەتایبەت ئەوانەی کەپەیوەندیان بەقۆناغی پێشئۆدیبی و قۆناغی ئۆدیبییەوە هەیە،بەمەیش ئەوە لەبیردەکەن ئەم قۆناغانە شیکردنەوەیەکی چاك پێشکەش دەکات، بەلآم نەك بۆهەموو زەمان و شوێنێك.ئەمە بۆحاڵی حازر و کۆمەڵی ڕۆژئاوا گونجاوترە.لەپاڵ ئەمانەدا بەپێچەوانەی مێینە ڕادیکاڵەکانەوە شیکردنەوەی فیمینزمەکانی _شیکردنەوەی دەروونی لەپێشکەش کردنی بنەمایەکی مادی یا ڕاڤەکردنێکی مادی بۆچەوساندنەوەی ئافرەتان سەرنەوتن، بەڵکو بەپێچەوانەوە شیکردنەوەی فێمینیزمی دەروونی پشتی بەبونیادی دەروونی بەستووە کەڕەخنەگرانی ئەم ڕەوتە بەشتێکی خەیاڵییان داناوە.

٥

## ڕەوتی فێمینیزمی شۆسیالیزم

بــــەلاّم ســــەبارەت بــــە ڕەوتــــی شۆســــیالیزمی هەنــــدێك لەفێمینیزمــەکان، ئــەوە دەشــێ بەشــێوەیەکی چــاکتر لێــی تێگەیەنریٚ،بەوسیفەتەی ڕەوتێکە کە ڕەوتی ڕادیکاڵی مارکسی و شیکردنەوەی دەروونـی کۆدەکاتـەوە.ئـەم ڕەوتـە لـە ئـەنجامی بێزاربوونی هەندێك لەفێمینیزمە مارکسییەکان لە تێپەڕنەکردنی بیری مارکسی بۆدابەشکردنی جنسی و باری نزمی باری نزمی ئافرەتانەوە سەری هەڵدا،هەروەها لەڕووکردنی ئافرەتان بەرەو ڕەتکردنەوەی چەوساندنەوەی  ئافرەتان لەوەوە کە لەگرنگیانـدا هاوتــای چەوســاندنەوەی کرێکــاران نیــەو وایدائــەنا،ئــەوەی ئافرەتان لەسەردەستی پیاوان تووشی دەبن و دەیچێژن بەراورد نـاکریٚ لەگـەڵ ئـەوئازارو مەینەتیـەی کـەپرۆلیتار لەسەردەسـتی بۆرژوازەکان دەیچێژیٚ.

بــەم شــێوەیە زۆر لــە فێمینیزمــی شۆســیالیزمی هاوچــەرخ گەیشتنە ئەوقەناعەتەی ژیان لەکۆمەڵێکی چینایەتیداتاکە هۆی ســەرەکی چەوســاندنەوەی ئــافرەت نیــە(١١)_هەرچــەندە زۆر لەئافرەتان چونەتەبازاڕی کارکردن و لەڕووی ئابووریـەوە لـەزۆر





دەوڵـەتی شـیوعی وەك کوبـاو چین ویـەکێتی سـۆڤێتی جارانـدا پێش ڕووخانی، پشتیان بـەخۆیان دەبەست،بەڵام ئافرەتـان لـەم کۆمەڵگایانەشــــدا بەتــــەواوی وەك ئافرەتــــانی کۆمــــەڵگای ســەرمایەداری_هەرلــەژێر چــەپۆکی پەتریارکیــدا مانــەوە.بۆیــە فێمینیزمـە شۆسـیالیزمەکان وادەبیـنن کـە فێمینیزمـە مارکسیە باوەکان لەتوانایاندایـە ئـەو چۆنێتییە تەفسیربکەن کەبەهۆیـەوە سـەرمایەداری جێگـای کـاردن و ناومـاڵی جیاکردەوە.بـەلاّم ئـەو بزوتنــەوە فێمینیــستانە نــاتوانن تەفــسیرێکی مــەنتیقی بۆئــەو هۆکارانــە بکــەن کەلەپیناویــدا ســەرمایەداری ژنــانی بۆکــاری ناومـاڵ و پیـاوی بۆکـاری دەرەوە دەسـت نیـشانکردووە. بۆیـە فێمینیــــزم سۆشیالیــــستەکان وادەبیــــنن کەفێمینیزمــــە مارکسییەکان نـاتوانن وێنایـەکی ڕوونـی ئـەو هۆکارانـە بـدەن کەلـەپێناویا ئافرەتـان لـەناو ماڵـداو دەرەوەی ماڵـدا ملکەچـی پیـاوان دەبـن.بۆیـەپۆلێنکردنی مارکسی لـەهی سـەرمایەداری جیانیــە، چــونکە هــەردووکیان ســەرکەوتوو نــین لەبۆچــوونی دابەشـکردنی ڕەگـەزدا. فێمینیزمـە شۆسیالیـستەکان پـەرەیان بەدوو ڕەوتی تیۆری جیاوازدا ئەوانیش: ڕەوتێك بـەرەو تیـۆری سیــستمی دوانــەیی (theory dudalsystems)و ڕووگەیــەك بــەرەوتیۆری سیــستمە یــەکگرتووەکان (unified_sytems theory)  هــەردوو ڕەوتەکــە ئامانجیانــە ڕاڤەیــەکی تــەواوی چەوســاندنەوەی ئافرەتــان پێــشکەش بکــەن، بــەلاّم بــەڕێگای جیـاواز. تیـۆری سیـستمی دوانـەیی لای وایـە پاتریـارکی و

سەرمایەداری دوو نموونەی جیاو جیاوازی پەیوەندی کۆمەڵایەتی پێشکەشدەکەن دەکەن ئەویش لەڕێگای کۆمەڵێك بایەخی جیاوازەوە،ئەم دوونموونەیە لەکاتی تێکەڵاو کردنیاندا دەبنە هۆی چەوساندنەوەی ئافرەت بەچەند ڕێگایەك وێنەو شێوەیان توندتر دەبێت.بۆیە ئەگەر ویستمان لەڕاسیتی چەوساندنەوەی ئافرەتان بەشێوەیەکی تەواوبگەین پێویستە پاتریارکی و سەرمایەداری شیبکەینەوەبەوسیفەتەی یەکەم دیاردەی سەربەخۆن پاشانیش بەوسیفەتەی چەند دیاردەیەکن بەیەکەوەنووساون.بەڵام ڕووگەی تیۆری سیستمە دوانەییەکان زۆر ئاڵۆزە.تیۆر داڕێژانی سیستمە دوانەییەکان لەگەڵ سەرمایەداریدا مامەڵەدەکەن بەو سیفە تەی کەبونیادێکی مادی و مێژوییە و لەشێوەی بەرهەمهێناندا چەسپاوە .لەکاتێکدا تەنها کەمێکیان وەسفی بەتریاکی وادە کەن کە بونیادێکی مادی ومێژوویی چەسپاوە لەشێوەی زایین و شێوەی جنسیدا .پەتریارکی لای زۆرینەیان بونیادێکی نامادییە«مەعنەوی» ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ .پەتریارکی بونیادێکی تیدیۆ لۆچی یاشیتەڵکاری دەروونییە سنوری زەمان وشوێنی پەڕاندووە . « mitch ell ١٩٧١» کەنوێنەری ئەو ڕەوتەیە کەدەڵێ «بەتریارکی بونیادێکی نامادییە لەبەرامبەر سەرمایەداریدا کەبونیادێکی مادییە » وادەبینێ کەهەندێك لایەنی گوزەرانی ئافرەتان لەناو خێزاندا ئابورییە لە بنەڕەتدا ،ئەویش بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەی کەبەسەر شێوازی بەرهەمهێناندا هاتن





.لەکاتێکدا هەندێکیان بیۆ لۆجی/ کۆمەڵایەتین ،چونکە دەرەنجامی کارلێکی سیماو خەسڵەتی بیۆلۆجی مێینەن لەگەڵ دەوروبەری کۆمەڵایەتیدا هەندێکی تریشی ئیدیۆلۆجییە وك ئەنجامی بۆچونی کۆمەڵە بۆئەو ڕێگایەی کە بەهۆیەوە ئافرەتان پەیوەندی بەپیاوانەوە دەبەستن، پاشان گۆڕانکاری زۆر کارناکاتە سەر شێوازی بەرهەمهێنان لەهەردوو لایەنی ئیدیۆلۆجی و بیۆلۆجی /کۆمەڵایەتییەوە ،هەردوکیان وەك چۆن بوون بەشێوەیەکی بنەڕەتی دەمێننەوە .بۆیە تەنانەت لەژێر سایەی شیوعێتیشدا بەشێوەیەك ئافرەتان بەچەوساوەیی دەمێننەوە ئەگەر شیوعیەت بەو شێوەیەی زاڵدەبێت بەسەر سەرمایەداریدا ئاوەهایش بەسەر .پەتریارکی دا زاڵنەبێت .هەرچەندە دەکرێ لایەنی ئابوری بەتریارکی بەوەسیلەی مادی لەڕێگای گۆڕینی شێوازی بەرهەمهێنانەوە بگۆڕدرێ، بەڵام توانای گۆڕین لەلایەنە ئیدیۆلۆجی و بیۆ لۆجی و کۆمەڵایەتییەکەوە هەر تەنها بەوەسیلەی غەیرەمادیەکە دەبێت ،ئەویش لەڕێگای دووبارە نوسینەوەی هەڵوێستی دەروونی /جنسییەوە کە ئافرەت و پیاو بەو شێوەناسراوە بۆماوەیەکی زۆر پێکدەهێنێ کەدەیزانین. بەڵام هەرتمەن ( ١٩٨١ hartmann) خاوەنی ئەو بۆچوونەی کەدەڵێ بەتریارکی و سەرمایەداری بنیاتێکی مادیین ،ئەم ڕەوتەیە بەوشێوەیە پێناسەدەکات کەبریتی بێت لە کۆمەڵێك پەیوەندی کۆمەڵایەتی ،نێوان پیاو ژن لەسەر بناغەیەکی مادی، لەڕێگای

سیستمی چینایەتییەوە هاوکاری وهاوپشتییەکی ئاڵوگۆڕکراوی لای پیاوان دروست کردووە یارمەتیداون بەسەر ئافرەتاندا زاڵبن .ئەم زاڵبونە بەهۆی کۆتکردنی توانای گەیشتنی ئافرەتان بەبواری ئابوری گرنگ ، هەروەها بەهۆی ڕێگرتن لەئافرەتان بەوەی بەویستی خۆیان توانای سێکسی خۆیان بەکاربهێنن پێکدێت بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەستەبەتوانای زایینەوە ،بەڵام ئەم زاڵبونەی پیاوان بەسەر هێزی پیشەیی ئافرەتاندا لەکۆ مەڵگایەکەوە دەگۆڕێت بۆکۆمەڵگەیەکی تر وەك چۆن لە زەمانێکەوە بۆ زەمانێکی تر دەگۆڕێت. بۆیە (hartmann ١٩٨١)پێی وایە کە .پەتریارکی زۆرتر لەبواری مادیدا چالاکدەبێت نەك بواری سایکۆلۆجی. بەپێچەوانەی ئەمەوە خاوەنی تیۆری یەکگرتوو کەهەوڵی تەفسیر کردنی چەوساندنەوەی ئافرەتان لەڕێگای بەکارهێنانی تاکەچەمکێکەوە دەدات کەسەرمایەداری لەبەتریاکی جیاناکاتەوە_وادەبینێت کەشیکردنەوەی دابەشکردنی کار لەپێشترە لەبەرئەوەی لەشیکردنەوەی چینایەتی دیاریکراوتروفراوانترە.شیکردنەوەی چینایەتی ئامانجێتی مەسحی سیستمی بەرهەمهێنان وەك گشت بکات ،بەمەیش جەخت لەسەر کەرەستەی بەرهەمهێنان و پەیوەندیەکانی بەشێوەیەکی زۆرگشتی دەکات کەچی شیکردنەوەی دابەشکردنی کار بایەخی خۆی دەخاتە سەرتاك کە پرۆسەی بەرهەمهێنان لەکۆمەڵدا ئەخاتە ئەستۆی خۆی.شیکردنەوەی





دابەشکردنی کارداوای گفتوگۆیەکی نەرموونیانی ڕۆڵی کەسێتی بۆرجوازی وپرۆلیتاریا دەکات،شیکردنەوەی دابەشکردنی کار گفتوگۆیەکی درێژی دەوێت کەچەند کارێك دەست نیشانبکات وەك:کێ فرمان دەردەکات؟کێ وەریدەگرێ؟کێ کاری ورووژێنەر دەات؟کێ کاری ڕەنجدەرانە دەکات؟

کێ کاتی کاری ویستراودەبات؟کێ زۆری دەداتێ؟کێش کەمی دەداتێ؟ بەڕوونی شیکردنەوەی دابەشکردنی کار دەتوانێ بەشێوەیەکی چاکتر تەفسیری ئەوە بکات کەبۆچی ئافرەتان بۆیان کراوە بەپیشە هەر فرمان وەردەگرن،

ڕەنجدەرانە کار دەکەن وکاری زۆر وەردەگرن کەئارەزوویان لێی نییە ئەویش بەکرێیەکی کەم.نوێنەرانی ئەم ڕەوتە سوورن لەسەر شیکردنەوەی دابەشکردنی کار وەك ئەلتەرناتیڤی ناتەواو بۆشیکردنەوەی چینایەتی.چونکە پەڕاوێز خستنی ئافرەتان و کردنیان بەنوێنەری هێزێکی پاشەکی لەبازاڕی کاردا خەسڵەتێکی جەوهەری سەرەکی سەرمایەدارییە.

ڕەوتی تیۆری سیستمی یەکگرتوو چەمکی نامۆبوونیش وادەخاتە ڕوو کەیەك چەمکە.مارکسیزمیش وادەبینێ کەکارکردن لەژێر سایەی سەرمایەداریدا دەبێتە چالاکییەکی نامرۆیی،چونکە بەشێوەیەکی وەهاڕێکخراوە کەدەمانخاتە سەر مەودایەك لەهەمووشتێك وتاکێك دامانئەبڕێت تەنانەت لەخۆیشمان. هەروەها بۆئەوە دەچێ کەسەرمایەداری

بەشداریکردنێکی ڕاستەو خۆیانەی لێمان دەویٚ تاکو هەستی نامۆبوونمان تیاپەیدابیێت،ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ئافرەتانەی کاری بیٚ بەرانبەر دەکەن نامۆبوون نازانن، بەلاٚم ئەوانەی کەکاربەکریٚ دەکەن لەگەلٚ نامۆبووندا دەژین بەو شێوەیەی کەپیاو هەستی پێدەکات.بۆیەئەم رەوتە لای وانیە کە بەمامەڵەکردن لەگەلٚ ڕوحی ئەم بیرو بۆچوونانەدا، نەك مانای ڕاستەوخۆ بتوانین ماناو تەفسیرێکی وەهای نامۆبوون بکەین بەپێی هەموو ئافرەتان و هەموو ئافرەتێك.(jaggar١٩٨٣)١٩ جاگار گفتووگۆی خۆی لەسەرنامۆبوون لەسیٚ بابەتدا ڕێکدەخات:جنسیەتی ئافرەت و دایکایەتی و عەقلاٚنیەتی ئافرەت. کرێکار بەو ڕێگاو شێوازەی هەستی بەنامۆبوون پێدەکات لەمەڕ بەرهەمی کارەکەی ئافرەتیش بەهەمان جۆر هەست بەنامۆبوون دەکات لەسەر ئەوەی کەبەجەستەی دەکرێت.ئافرەت دەڵێت وەرزش لەپێناو لیاقەتدا دەکات. ئەو خۆی بۆخۆی جوان دەکات و بەلاٚم خۆی لەڕاستیدا خۆی لەپێناوی پیاودا دەڕازێنێتەوە.دایکایەتیش تەواو وەك جنسیەتی ئافرەت وایە و لەڕێگایەوە ئافرەت لەگەلٚ ئەزموونی نامۆبووندا دەژی.

ئافرەت_وەك(jaggar١٩٨٣)١٥ دەڵیٚ: بەنامۆبوونەوە مامەڵە لەگەلٚ توانای منداڵنانەوەی خۆیدا دەکات کاتێك غەیری خۆی واتە پیاو_بڕیار لەسەر ژمارەی منداڵ دەدات کەلێی بکەوێتەوە.لەهەندێك کۆمەڵگادا کەڕێز بۆ ڕەنجدانی منداڵ





تەواو وەك ڕەنجدانی پیاو دەدرێت،چاوەڕوانی زایین لەئافرەت دەکرێت مادەم توانای جەستەییان بۆئەم کارە لەلا هەیە. لەکاتێکدا کە ئەو کۆمەڵگایانەی سەیری منداڵ وەك ئەرکێکی قورسی ئابووری دەکەن ورەی ئافرەتانی تیادادەبەزیٚ سەبارەت بەدوبارە زایین بەوشیوەیەی کەخۆیان ئارەزویان لێیەتی. بۆیە زۆر لەئافرەتان تووشی لەباربردن و نەزۆکی دەبن بیٚ ئەوەی خۆیان ئارەزویان لیٚ بێت. جاکار (jaggar١٩٨٣) ١٦ پێی وایە ئافرەتان تەنها لەڕێگای جنسیەت و دایکایەتیانەوە لەگەلٚ نامۆبووندا دەژین، ئەوانیش بە توانای عەقڵیەتی خۆیان نامۆن.

ئافرەت وایلێکراوە باوەڕی بەخۆی نەمێنێت بەو ڕادەیەی کەدوودڵە لەوەی ڕایگشتی خۆی دەربڕێت، ئەویش لەترسی ئەوەی ئەو بۆچوونانە شایانی باسکردن نەبن و بەسووکی سەیر بکرێن.ئەمە وایکردووە هەرخۆی بتوانێت زارەوەی فیکرو مەنتیق دیاری بکات. ٢٩ تیۆری سستمە دوانەییەکان کەوتە سەر ڕەخنە لەوەدا کەوای دائەنا ملکەچی ئافرەت بۆ پیاو خەسڵەتێکی گشتی و سەرتاپاییە.سیفەتێکی دیارو زەقی هەموو کۆمەڵگایەکی دوور لە گۆڕانکاری مێژووییە. نوێنەرانی ئەم ڕەخنەیە لایانوایە، یەکەم : ئەم بۆچوون و گریمانە لەلای ئافرەتان هەستی بیٚ ئومێدی دروست دەکات جگەلەوەی دەبێتە هۆی ئارەزووکردن و گرێدانی ڕۆشنبیریەکی عرقی ڕەگەز پەرستانەو چینایەتی توند ئەویش بەپشت بەستن بە بانگەشەکردنی بۆ وێنایەکی تەواوی پەتریارکی ژنی خاوەن

کاره گەورەکان بەدەست پەتریاکییەوە وەکو ژنی کرێکار ناناڵێنێت.دووەم: خاوەنی ئەم ڕەخنەیە لای وایە ئەم دانان و گریمانە سەرنجێکی درۆزنانە بەرهەم دێنێ. هەروەها تیۆری سستمەیەکگرتووەکان لەدووهەڵوێستەوە کەوتەبەر ڕەخنە.یەکەم لەسەر ئەوەیە کە کۆکردنەوەی کێشەی ئافرەت و بارودۆخی ئابووری لەڕووگەیەکی تاک تیۆردا یەکەم دەبێتەهۆی لکاندنی کێشە سەرەکییەکانی ئافرەت وەك زایین،پەروەردەو کێشەی سێکسی ئافرەت بەشیکردنەوەیەکی مارکسی نەگۆڕەوە.دووەم:ئەم کۆکردنەوەیە دەبێتە مایەی کورتکردنەوەو بچووککردنەوەی کێشەی ئافرەت و کردنی تەنهابەکێشەی کاروکرێکار.

-٦-

## فێمینیزمی وجودی

ڕوون و ئاشکرایە کەکتێبی ڕەگەزی دووەم(theseconsex)ی سیمۆن دی بۆڤوار(simone de beauvoir)بەدرێژایی سی ساڵ پایەیەکی گەورەی وەهای لەفیکری فێمینیزمی کلاسیکیدا وەدەست هێنا کەئەگەر هەموو دەست پێکێکی نووسینێکی فیکری مێگەری لێی نزیك نەبێتەوەو سوودی لێنەبینێت ونەیخاتە ڕوو گفتوگۆی لەسەر نەکات ئەوەتەواو دەرناچێت.ئەم کتێبە یارمەتی زۆر لەبزوتنەوەکانی فێمینیزمیدا بۆگەیشتن





لەگرنگی تەواوی ئافرەتان بەوسیفەتەی (ئەویتر)ن.دی بۆڤوار (de beauvoir ١٩٨٨) (١٧) وەك نوێنەری ڕەوتی وجودی فێمینیزم(existentinlist feminism)پێی وایە هەرلە کۆنەوە پیاو ناوی(خود)ی لەخۆی ناوەو ناوی(ئەویتر)یشی لەئافرەت ناوە، دوای ئەوە ئەگەر لەئەوی تردا هەڕەشەیەك هەبێت بۆ(خود)ئەوە ژن مەترسی و هەڕەشەیە بۆپیاو. ئەگەر پیاو ویستی سەربەست بێت ئەوە دەبێت ئافرەت بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.بێگومان ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئافرەت تاکە ئەویترە کەلە ژێر چەوساندنەوەدا دەژی.ڕەشپێستەکان لەلایەن سپی پێستەکانەوە دەچەوسێنرێتەوە.بەڵام چەوساندنەوەی ئافرەت بەدوو هۆ تاکو جیایە.یەکەمیان:بەپێچەوانەی چەوساندنەوەی عیرق و چینەوە) ڕاستیەکی (مێژوویی)چاوەڕوانکراونییە.دووەم :ئافرەتان ئەو هەڵوێستی نامۆبونەیان لکاندووە بەخۆیانەوە کەدەڵێ پیاو(ئەسڵە) و ئافرەتیش(لقە).ڕەوتی وجودی ڕەخنە ئاڕاستەی بێتوانایی ڕەوتە تیۆرییە فەلسەفیەکان دەکات ئیتربیۆلۆجی یا ڕەوتە سایکۆلۆجییە(فرۆیدی)یەکە یاڕەوتی مارکسی بێت لە تەفسیرکردنی هۆی ئەوەی بۆچی ئافرەت نەك پیاوئەسڵ و بناغەیەکە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی گرنگی ئەو شیکردنەوەو بیانوانەی کەدەربارەی چەوساندنەوەی ئافرەت خراونەتە ڕوو. هەروەها دی بۆڤوار وادەبینێ جیاوازی بیۆلۆجی بەشێوەیەك تەئویلیدەکات لەخزمەتی ئامانجی خۆیدا

بێت، بە توانستگەلێکی بیۆلۆجی جیاوازی سەرەکی نێوان پیاو وئافرەت دەزانێت کەخۆی لەنێرو مێدا دەبینێتەوە.

دی بۆڤوار(I) لای وایە نوسینەکانی فرۆید لەسەر ئافرەت وەك(ئەویتر)لاوازو ناتەواون.تیۆری فرۆید دەربارەی هەستکردنی کچ خۆی لەبەر نەبوونی ئەندامی نێرینە(کێر)لەلای وایکردووە پایەی کۆمەڵایەتی نزمی ئافرەت شتێك بێت دوورکەوتنەوەلێی ناشیاوبێت.بەمەزەندەو باوەڕی دی بۆڤوار ئەم بۆچوونەی فرۆید،شیکردنەوەیەکی دەروونی لاوازە.

مەینەتی و موعاناتی ئافرەت بەهۆی نەبوونی ئەندامی نێرینەوە بەپێی بۆچوونەکەی فرۆید لەدیدی دی بۆڤوارەوە شتێکی ترە، دەرەنجامی ئارەزوکردنی ئافرەتە بۆگەیشتن بەو پلەو دەستکەوت وخەسڵەتەمادی سایکۆلۆجیانەی کەپیاو دەستی دەکەوێ نەك حەزکردنی ئافرەت لەوەی ئەندامێکی نێرینەی پیاوی هەبێ.سیفاتی جیاکەرەوەی پیاوان_وەك دی بۆڤوار بۆی دەچێ_ناکرێ بگەڕێنەوە بۆڕووخساو شێوەی ئەندامی نێرینە.بەپێچەوانەوە،پلەی ئەندامی نێرینە ئەتوانرێ بەگێڕانەوەی بۆزاڵبوونی باوك تەفسیربکرێت. لەبەرئەمە ئافرەتان ڕەگەزێکی تربەهۆی نەبوونی دەسەڵات لای خۆیان پێك دەهێنن نەك بەهۆی نەبوونی ئەندامی نێرینە لەلایان.وەك نمونەیەکی ڕەوتی وجودیش دی بۆڤوار (٢٠) سەیری ئافرەتی کردووەو (خودێکی)جیاکردۆتەوە پیاو وەك(ئەویتر) ناسیوێتی.لەپێناوی دەست نیشانکردنی بەهانەیش بۆئەم





پێناسانە دی بۆڤوارتێبینی کردووە ئەوکاتەی ئافرەتان خۆیان بەهێزتردەکەن و خۆیان زیاتر وەك بکەر و مەخلوقی سەربەست دەبینن بیروبۆچوونی (ئەویتر)دەردەکەوێ.لەوساتەوە پەیوەندی لەگەڵ (ئەویتر)ا دەبێت بەدراماتیکی،و لەبوونی (ئەویترا) دەبێت بەهەڕەشەو مەترسی،ئەمەیش بەچەند هۆیەك زۆریان پەیوەستن بەڕزگاربوون لەئەرك و قورسایی منداڵانەوە.بۆپیاو وەخت و وزە هەن بۆ بەکار هێنانی ڕەشەباو هەواو ئاگرو ئاو لەپێناوی داهێنان و دۆزینەوەی کەرەسەگەلێك یارمەتیاندا بۆ پێکهێنانی ئاینده، خۆی بەبکەری بەتوانای شیاو داناوە بۆموغامەرەکردن بەژیانی خۆی لەشەڕێك یان ناکۆکییەکدا.پیاو ئافرەت بەو بوونەوەرە ملکەچە دەزانێت کەتەنها توانای زاینی هەیەو بەس، پاشان ئەوە موغامەرەیە نەك توانای ژیان بەخشین کەوایکردووە پیاو بەسەر ئافرەتدا سەرکەوێ. بەم شێوەیە گەوررەیی و باڵا دەستی بەخشرا بەو ڕەگەزەی کە ژیان زەوت دەکات و دەیبینێتەوە نەك بەوەی بەوەی کەژیان دێنێت و دەیدا. بەهۆی ئەو جیاوازییە درووستکراوانەوە ئافرەتان لەلایەن پیاوانەوە دوورخرانەوە بۆ رووبەری ئەویتر کەپەیوەندیەکی توندو تۆڵی بەجەستەوە هەیە.دەکرێ ئەو ڕەخنەیەی لەکتێبی ڕەگەزی دووەمی سیمۆن دی بۆڤوار دەگیرێ لەسێ خاڵدا چڕبکرێتەوە.

یەکەمیان:هەمووئافرەتان ناتوانن بەکتێبەکە بگەن ،چونکە ئەو چەمکانەی کەبەهۆیەوە کتێبەکە پێك دێت وەك چەمکی بوون،بوونی خود و بوون لەخود دا هەموویان چەمکگەلێکن

ڕاستەو خۆ لە شارەزایی ژیانی ئافرەتانەوە هەڵنەقولاُون، بەڵکو سەرچاوەیان لەتیۆر کاریی تەجریدی فەلسەفیی وەرگرتووە.

دووەم: ئیلشتین(ELSHTAIN١٩٨١) ٢١ ڕێگا لەو شێوەو چۆنێتیە دەگرێت کەدی بۆڤوار مامەڵەی لەگەڵ جەستەی ئافرەتدا پێکردووە.ئیلشتین لای وایە دی بۆڤوار وەك شتێکی نەریٚ وبێبەخت و بێبایەخ مامەڵەی لەگەڵ کردووە یانی وەك شتێکی پیس و ئابڕووبەر.ئیلشتین ئەمەیش بۆ بۆچوونی بوون لەمەڕ جەستە دەگەڕێنێتەوە بەو سیفەتەی کەبارێکی قورسە بۆی هەم وەك جۆرو هەم وەك هەند بەپێچەوانەی جەستەی پیاوەوە.وەك ئەم رەخنەیە رونیدەکاتەوە ترس وای لەدی بۆڤوار کردووە هێرش بکاتە سەر دەزگاکانی ژن هێنان و دایکایەتی و دایاندەنیٚ بەدەزگاگەلێکی ستەمکار کەدەبێت ئافرەت ڕەتیان بکاتەوە. لەکۆتاییدا ڕەخنە لەدی بۆڤوار گیرا، چونکە هەندیٚ چەمك و بەهای نێرینەی قبوولکرد و بایەخی پێدان.هەموو ڕەخنەیەك کەدی بۆڤوار ئاراستەی جەستەی ئافرەتی دەکات لە خەسڵەتی جەستەی پیاو سەرچاوە دەگریٚ.

## ٧

## فێمینیزمی پاش نوێگەری

بەڵام کتێبی ڕەگەزی دووەمی دی بۆڤوار بوو بە بنەمایەك بۆبەشێك لەتیۆرکاری مێگەریی پاش نوێگەری.تاماوەیەکی نزیکیش بەهەموو بزووتنەوە مێگەریەکانی پاش نوێگەرییان





دەوت بزوتنەوە فێمینیزمە فەرەنسیەکان ،چونکە زۆربەی زۆری ئەوئافرەتانەی ئەم تیۆرانەیان دائەڕشت یان فەڕنسی بوون یان لەفەڕنسا دەژیان،بەتایبەتی لەپاریس زاراوەی فێمینیزمی_پاش نوێگەری( POST MODERN FEMINISM) سەرنجی خەڵکی ڕاکێشا کاتێك کەخوێنەر دەرکی بەوەکرد ئەوەی نووسەری وەك ئیریجاری سیسۆو کریستیفا (CXOUS.LRIGARAY.KISTEVA) لەدەوری یەك کۆدەکاتەوە دیدو بیرو بۆچونی فەلسەفییانە کەدەیخەنە ڕوو نەك فەڕەنسییەتییەکەیان.ئەوان لەوبیرو بۆچوونانەیاندا بەشداریان لەگەڵ تیۆرکارییەکانی پاش نوێگەریدا دەکرد وەك لاکان و دریدا . J.LACAN AND ) J.DERRIDA).

ئەم رەوتە لەسەر تیشکخستنە سەر ئەو دژەناوەکیانە دروستدەکرێت کەسیستمی ئەوبۆ چوونانە هەڵی دەگریٚ کەبۆ ڕوخانی ئەوچەمکانە ئاڕاستە دەکریٚ پەیوەستن بەدەسەڵات و شوناس وخودەوە.هەموو بزوتنەوە فێمینیزمەکانی سەر بەم ڕەوتە بایەخێکی زۆر بەدووبارە ڕاڤەکردنەوەی نەریتی شیکردنەوەی دەروونی فرۆیدی دەدەن چی لەسەر ئاستی تیۆری بێت یان ئاستی پڕاکتیك.هەروەها زۆربەی ڕەگەکانی فێمینزمی پاش نوێگەری لەکارەکانی نووسەر سیمۆن دی بۆڤواردا هەن و ئەو پرسیارە سەرەکییەی تیۆری مێگەرییان وروژاندوە کەدەڵیٚ(بۆچی ئافرەت ڕەگەزی دووەمە؟)یا وەك

ئەوەی فێمینیزمی پاش نوێگەری بەم شێوەیە دەیخاتەڕو و وێنای دەکات (بۆچی ئافرەت ئەویترە؟)

فێمینیزمی پاش نوێگەری چەمکەکەی دی بۆڤوار لەمەڕ ئەویتر وەردەگرێ، بەڵام پاش سەرەو گێڕکردنەوەی. ئافرەت هێشتا هەر(ئەویترە)،بەڵام لەجیاتی ئەوەی ئەم کارە بەشتێکی والێکبداتەوە کەپێویستە ڕەتکرێتەوەو بەهەند وەرنەگیرێ، بەڵام فێمینیزمی پاش نوێگەری باوەڕیان بەباشەی هەیەو دەریدەبڕن. باری (ئەویتر) بۆ ئافرەتان ئەوە دەڕەخسێنێ و ڕەخنە لەو بەهاو پێوەر و پڕاکتیکانە بگرێ کەداوای ڕۆشنبیری پەتریاکی دەسەڵاتدار دەکات بۆداسەپاندنی بەسەر هەمواندا بەوانەیشەوە کەلە پەڕاوێزیا دەژین بۆیە چەمکی ئەویتر بەهەموو پەیوەندیەکانییەوە بە چەوساندنەوە و نزمزانییەوە لە تەنها چەوساوەیەك و پلەنزمێك زیاترە هەروەها بیرکردنەوەو گفتوگۆ ڕێگا بۆ فرەیی وجیاواز و هەمە چەشن دەکاتەوە بەم شێوەیە هێڵی سەرەکی فێمینیزمی پاش نوێگەری لەپتەو کردنی لایەنی نەرێیی ئەویترا خۆی دەنوێنێ کەدوورخراوەو دۆڕاو ڕەتکراو و پەڕاوێز خراو دەبێت و دەمێنێتەوە.ڕێبازەکە دیدێکی ڕەخنە گرانە بەرامبەر بەهووشتێك وەردەگرێ بە بیرو بۆچونە دیاری کراو و کارەکۆمەڵایەتییە،جگە لەو پێکهاتەیش کەبەهۆیەوە بونیان دەبێت هەروەها جگە لەو زمانەیشی کەبیری پێدەکەنەوە ،ئەو سیستەمەیشی کەپەنای بۆ دەبەن و خۆیانی پێدەپارێزن.





ئەم بزوتنەوەیە بزوتنەوەیەکە دژی بنەماو ئەسڵ و میسالیەت،ئەمەیش تەنها لە گەڕانیا بەدوای پێناسەی گشتگەرا دەرناکەوێت بەوسیفەتەی کەشتێکی سەرەکی نیە بەڵکو لەڕووبەڕوو بوونەوەی بەکاریشیان دژی سنوری باوی نێوان دژگەرای نێو چەمکی وەك عەقلانی/سۆزداری/جوانی/ناشیرینی/خود/ ئەویترا دەردەکەوێ. هەروەها ئەو سنورە جیاکەرەوانەی نێوان وەك زانستی هونەرو زانستی دەروونی و زیندەوەرزانی.جەدەلی ڕەوتەکانی فێمینیزمی پاش نوێگەری بەردەوام دەبێت تا هەندێك لەو بۆچون و گریمان و بۆچونە گرنگانەیش بگرێتەوە کەزۆرینە بەشداری تیادەکەن.ئەو ئەوگریمانانە باوەڕیان بەبوونی یەکەیەکی سەرەکی نێو زەمان و شوێن هەیە پێی دەوترێ ناسنامەی گشتی ، و یەکەیەکی سەرەکی تریش باوەڕی بەبوونی یەك پەیوەندی سەرەکی هەیە لەنێوان زمان واقیعدا کە بە ڕاستی(الحقیقە) ناسراوە،ئەو ڕایەی کە بۆ بوونێکی یەکگرتو و گونجاو دەچێت ڕەخنەو تانەی ئەو بۆچوونەی لێدراوە کە لەسەر ئەوە بنیاتنراوە

خود لەبنەڕەتدا بەسەر دوومەودادا دابەشکراوە،مەودای هەست و مەودای بێهەستی. ئەو ڕاستیەشی کەتاکە بوونی لاپەسەندە لەوەدا ڕەخنەو تانەی لێدراوە کە گوایە پەیوەندی نێوان زمان و واقیع جۆراو جۆرو گوازراوەیە، دوای وشەشت یا چەند بەشێکی ڕاستی دەرنابڕێت، بەڵکو راستی پێچ و پەنا بۆ زمان

دەهێنێتەوە لەكاتێكدا كەزمان ئەو ڕەتدەكاتەوە بەڕاستی كۆتبكرێت. ئەویرو بۆچوونەی كەدەڵێ شوناسی خودو حەقیقەت بوونی نیە،و ئەوسیستمەی كە لەژیان و زماندا هەیە لەتەنها بونیاد و شێوەیەكی سەپێنراو غەیرەسەرەكی نیە، ئەو بیرە سەرنجی نووسەر و تیۆر دارێژی وەك هیلین سیسو Helen cixous ولویس ئیریجاری جولیا كریستیڤای Julia kristeva ڕاكێشت، بەڵام ئەویش تاكە بیر نیە سەرنجی ڕاكێشین. هەروەها فێمینیزمی ئەم ڕێبازە بیری تیۆری هەڵوەشاندنەوەیان cdecons trutios ts بەكارهێناوە كەلای وایە زمان بە چەند شێوازو ڕێگایەك لەسەر دوورخستنەوەی مێیینەتی لەسەری بەرزدەبێتەوە. لەگەڵ ئەو تێبینیە بێزاركەرانەی كە lacan and derrida دەربارەی جنسیەتی ئافرەت پێشكەشی كردون، بەڵام فێمینیزمی پاش نوێگەری ڕاكانیانی دەربارەی مێیەتی دورخراوە بەشێوەیەكی زۆرگەورە بەكارهێناوە. لەبەر ئەمە بزوتنەوەكانی فێمینیزمی پاش نوێگەری ڕوبەڕووبوونەوەو وەستان دژی بەهاڕەمزییەكان بەكایكی قورس دادەنێن، بەتایبەتی كاتێك ئەو زاراوانەی كەدەشێ بەكاربهێنرێن لە بەدیهێنانی ئەوەدا هەمان ئەو زاراوانەن كە ئەم بەهاو نەریتانە پێشكەشی كردون. چونكە مەترسی ئەنجامدانی ئەم كارە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە كەسوربوونی لەسەر دووفاقەیی و فرەیی و جیاكاری فێمینیزمی پاش نوێگەری والێدەكات یاجەخت لەسەر





غەیبیاتی باوبكات یا لەسەر پێوەری ڕاستەقینەی بانگەشە بۆ كراوە. ئەم مەترسیە پاڵی بە مێگەری پاش نوێگەرییەوە ناوە بۆ ڕەتكردنەوەی هەر ناولێنانێ یاپۆلێنێك كۆتایی بە هەر پێوەرێك یا مەزهەبێكی جیاكراوە بێنێت، ئەو ناو لێنانانە دڵە ڕاوكێ و دوودڵی فێمینیزمی پاش نوێگەری دروستدەكەن، چونكە ئارەزوویەكی هەڵگرتووە بۆڕێكخستنی چەمكی بەشەریی و دارشتنی بەچوار چێوەی عەقلانی.لەگەڵ ئەمانەشدا قورسە هەریەكە لە لویس ئیریجاو جولیا كریستیڤا بەفێمینیست ناوزەد نەكرێن بەتایبەتی ئەوانە زۆرترین بیرو بۆچونی ڕادیكاڵی بەمەبەستی بانگەشە بۆ ڕزگاربوون لە ڕەگو ڕیشەوە پێشكەش بەئافرەتان دەكەن، ئەمەیش بانگەوازە بۆڕزگاربوون لەبیرە چەوسێنەرەكان.زۆربەی ئەو ڕەخنانەی كەلەفێمینیزمی پاش نوێگەری دەگیرێن لەسەر ئەو وێنە باوە درووست دەبن كەزۆر لەئەكادیمییەكان هەڵیدەگرن بەو سیفەتەی ئەوان كەسانێكن لەبورجی بەرزدا دەژین و دوورن لەجیهانی ڕاستە قینە، واتە عەقڵگەلێكن لەجیهانێك لەبیرو بۆچووندا دەژین نەك جەستە گەلێكن عارەق بڕێژن یا تێبكۆشبن یاماندوبن.ڕەتكردنەوەی فێمینیزمی پاش نوێگەری لەلایەن هەندێك لەڕەخنەگرانەوە خۆی لەڕەتكردنەوەی خۆسەرقاڵكردن بەگفتوگۆكردن لەسەر جۆرە بیرێك دەبینێتەوە ناوی بیرو بۆچوونی پالأوتەی لێدەنرێ ئەوچینەی كەلەهەوڵ و ڕەتكردنەوەی پاشەكشێی كرد بۆبەهەشتێكی فەلسەفی دەورەدراو بەهاوڕێیانێك كەلە

هەڵگرتنی یەك بیرو بۆچوندا هاوبەشن. فێمینیزمی پاش نوێگەری (زمان) و (بیرێك) بەشێوەیەكی وەهابەكاردەهێنیٚ نایەڵێت ئەوانیتر لەو چۆنێتییە بگەن كەئەمانی فێمینیزم كاری پێدەكەن.دوای ئەوەو لەگەڵ وەخت و زەمەندا ئەوانەی كەئەمان بانگەشەی بۆدەكەن لەزۆربەی ئافرەتان دوورئەكەونەوە.ڕەوتەكانی فێمینیزمی پاش نوێگەری (٢٣)لەوەیشدا بەر ڕەخنە دەكەون كەبارودۆخی پلەی ئافرەت دەخەنە سەروی پیاوەوە،مێیەتیش دەخەنە شوێنێكی بەرز ترلەشوێن وپلەی نێرێتی .ئەوڕەخنانە بەدیاریكراوی ئاراستەی نووسینەكانی هەریەك CIXOUS AND lirgaray دەكرێن، چونكە هەوڵدەدەن زمانێكی مێینەو كۆمەڵگایەكی مێینە لەدەرەوەی زمان و كۆمەڵگای نێرینەدا بخولقێنن.ئەمەیش بەرەو دوو ڕێباز دەچێت و سێیەمی لێنابێتەوە،یابەرەو فاشێتێكی پەترياركی دەڕوات یابەرەو فاشێتێكی دایكایەتی _ئەم ڕەخنەیەی دواییان لەسەر ئیمكانیەتی بوونی حاڵەتێكی تەواو لە شڵەژاندن و شێواوی دروست بووە، ئەشیٚ گریمانی فەلسەفی فێمینیزمی پاش نوێگەری بوبێتە هۆی دروست بوونی ، ئەویش لەترسی ئافرەتان و ڕێبازی فێمینیزمی، لەوەی نەتوانن پەیوەندی درووستبكەن بەو سیفەتەی كۆمەڵێكن خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش.

**(كۆتایی)**





## فێمینیزمی كۆمەڵگای عەرەبی

فێمینیزم لەكۆمەڵگای عەرەبیدا بەشێوەیەكی ناوەكی دەبێت بەبەشێك لەوەیكەڕۆژئاوا پێی دەڵێت (فێمینیزم لەجیهانی سێیەمدا)

لەبەر ئەوەی جیاوازیەكان لەنێوان ئافرەتانی جیهانی سێیەم و ئافرەتانی ئەوروپاو ئەمریكا بەشێكن لەكێشە سەرەكییەكانی لكاو بەفێمینیزمەوە)زۆر لەنووسینی فێمینیزمەكان دەركەوتون چەوسانەوەی ئافرەتان لەئەورووپاو پەڕاوێز خستنیان دەبەستنەوە بەهەردوو چەمكی دابەشكردنی جنسی(gendar)و پەیوەندی چینایەتیەوە (class).هەردوو چەمكەكەیش جگە لەڕەگەزگەری و ئیمپریالیزم، پەیوەستن بەچەوساندنەوەی ئافرەتان لەجیهانی سێیەمدا.ئەم مەودایادكراوانە بۆكێشەی ئافرەت لەجیهانی سێیەمدا سیٚ تەوەریجیا پێكدەهێنن كە پێویستە لە ڕێیانەوە خەباتی ئافرەت لەم كۆمەڵگایانەدا وەرگیرێت و بەباشی لێی بگەین .شیرل_جۆنسۆن_ئۆدیم (cheryl Johnson _odim ١٩٩١)٢٤ وادەبینێت كەدەیەی حەفتاكان سەرەتای پێكهێنانی بزوتنەوەیەكی ئافرەتانەی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام هەر ئەو كاتە تازە زۆر لەئافرەتانی جیهانی سێیەم دەستیان بەوە كردبوو لەژێر زەبرو زەنگی ئیستعمار دەرچن، زۆریش لێیان لەوانەی كەلە ڕۆژ

**ئاوادا دەژیان _هەروەها لەخیلالی گرنگترین بزوتنەوەی مافی مرۆڤ لەسەدەی بیستدا دەرکەوتن. بۆیە ئیستیقلال و ئەویاسایانەیشی کەچەسپین بەو سیفەتەی دەرەنجامی بزوتنەوەی مافی مەدەنین یەکسەر باشییان بەسەر بارودۆخ و گوزەرانی زۆرینەی ئافرەتانی جیهانی سێیەمدا نەهێنا.ئەوەیشی گومان هەڵناگرێت،ئەم فاکتەرانە بناغەیان بۆچەمکی فێمینیزم پێکهێنا بەو سیفەتەی فەلسەفەو بزوتنەوەی داد پەروەریی و کۆمەڵایەتییە لەم کۆمەڵانەدا. هەربۆیە هیچ شیکردنەوەیەك کەهەر تەنها لەسەر دابەشکردنی جنسی بێ خستنە ڕووی جیاوازی ڕەگەزی و چینایەتی بەرز بێتەوە ئێش و دەردو خەمی ئافرەتانی جیهانی سێیەم بەشێوەیەکی ورد وەسف ناکات.ئی لیکوك(e.leacock ١٩٧٧) ٢٥ لای وایە لەکۆمەڵگا تازە گەشە سەندووەکاندا هەرتەنها دابەشکردنی سەرچاوە لەناوەوە گرنگ نیە، بەڵکو بەرهەمهێنان و دەست بەسەراگرتنی بەڕێك و پێکی گرنگە. کارەکەیش هەرتەنها دۆزینەوەی هەلی یەکسان نیە لەنێوان پیاوان و ئافرەتاندا بەڵکو داهێنانی هەلەکان خۆیانن. هەروەها کارەکە باری ئافرەت نییە لە کۆمەڵگادا، بەڵکو دۆخی ئەو کۆمەڵگایانەن کەئافرەتانی جیهانی سێیەم خۆیانی تیادەبیننەوە.ئاوەها ئافرەتانی جیهانی سێیەم ناتوانن پێکهێنانی بیری مامەڵە کردنی یەکسان لەنێوان دووڕەگەزەکەدا بێننە کایەوە. هەروەها ناتوانن هەر تەنها پرنسیپی هاوکوفی هەلیش لەنێوانیاندا**





**فەراهەمبکەن، ئەوەی کەفێمینیزم گەرەکێتی،بەلاَم ئافرەتانی جیهانی سێیەم دەتوانن چەمکی شوناسی جنسی دروستبکەن و هەموو ئیدۆلۆجییەتێکیش کەلەسەر دابەشکردنی ڕەگەز دروستبووە،ڕەتبکەنەوە.بۆیە دەبێت فێمینیزم لەم کۆمەڵانەدا ئیدۆلۆجێیەکی تەواو وسەراپا گیربێت.مارینا لەزەرگ(MARNIALAZREG )پێیوایەلەناو جەر گەی فێینیزمی ڕۆژ هەلاَت و ڕۆژئاوادا ئارەزویەکی پتەو هەیە لەهەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆمەڵی و سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی تالەگەڵ پێویستیەکاندا بڕوات .بەلاَم مێینە گەری لەڕۆژهەلاَت وڕۆژئاوادا دەربارەیچەمك وئەو کەرەستانەیکەپێویستن بۆ هەڵوەشاندنەوەی سیستم بەکار بهێنرێن جیان، هەروەهالەسەر ئاستی ڕادەو مەودای توانای گۆڕینی شتەکان بەپلەی یەکەم جیان لەیەك ،بزوتنەوەکانی ئافرەتان لەڕۆژئاوا بەکردەوە دەتوانن خۆیان سەرلەنوێ وەك ئافرەت بدۆزنەوە ،هەروەها دەتوانن دووبارە پێناسەی خۆیان بکەنەوە و سەر لە نوێ مەعریفەی تایبەت بەخۆیان بدۆزنەوە، هیچ شتێکیش ڕێگایان لێناگرێ تەنها دەسەلاَتی نێرینە نەبێت بەسەریانا ئەمەیش هەموو بەئاگان لێی، بەزۆری بزوتنەوەکانی ئافرەت لەڕۆژئاوا لەسەر زەمینەی کۆمەلاَیەتی وفیکری خۆیان کاردەکەن ئەمیش لەژێر گریمانێکی سەلمێنراو دا کە وادەبینێت کۆمەڵگاکانیان کامڵبوون . بەپێچەوانەی ئەمەوە ،پرۆژەی بزوتنەوەی ئافرەتانی ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاست لەناو**

چوار چێوەیەکی دەرەکی سەرچاوەکاندا دەردەکەوێ و لەژێر ئەوەی کەپێوەرە دەرەکییەکان لەگەڵیدا یەکسانەبن. لەژێر ئەم بارودۆخەدا هۆش و ئاگایی ئافرەت لەخۆی لەگەڵ ئەو دەرك پێکردنەدا یەکدەکەون کە دەڵێ ئەو هۆشیارییە بەشێوەیەك بەهۆی کەسانی تر لەدەرەوە ، لەئافرەتان و پیاوان وەکو یەك پێکهاتووە. لەم خاڵی دەرپەڕینەوە وە ،پرۆژەی مێگەری لەرۆژهەلاتدا شێوێنراوە، بەم پێیەش کەمتر توانا بۆ ڕزگاربوونی دەرەخسێنێت وەك ئەوەی کەدەکرێ لەئەمریکاو ئەوروپا رووبدات.

هەڵبژاردەی شیعرو چیرۆك و ڕۆمان و وتاری ڕۆژنامەوانی و گوتار نوێەرەی کۆمەڵە نوسینی فێمینیزمی عەرەبییان پێکهێناوە. لەکاتێکدا کە زاراوەی مێینەگەری بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە ولاتی عەرەبدا ساڵی(١٩٠٩) دەرکەوتووە ،وەختێك (ملك حفنى ناصف)

بەناوێکی خوازراوەوە (باحثةالبادیة) لەکتێبێکدا کۆمەڵێك وتارو گوتاری بەناونیشانی (ئافرەتانە) بلاوکردەوە و تیایاندا داوای کرد باری گوزەرانی ئافرەت چاکبکرێت و شێوەیەکی تر لەزانستی فێرکردن بسەپێنرێت،ئەومافانەیشی کەئیسلام بەئافرەتی بەخشیوە بدرێنەوە بەئافرەت.هەندێك لەبزوتنەوەی مێینەخوازی عەرەب ئەوە دەڵێن وەك م.بەدران و م.کوك ( ١٩٩٥ M.BADRAN ٨ M.COOKE ) گفتوگۆی لەسەر دەکەن _بزوتنەوەی مێگەری عەرەبی لەکاتی دەرکەوتنیا وەك تۆوێکی





سروشتی لەجیهانی عەرەبیدا ڕوواوە هەروەها بەشێکە لەدیاردەجیهانییەکە.بەپێچەوانەی ئەمەیشەوە کەسانێکی تر ڕایان وایە کەچەمکێکی ڕۆژئاواییەو هاتۆتە ناوجیهانی عەرەبەوە.بەلام سەبارەت بەڕاو بۆچوونی ڕۆژئاوا بۆ فێمینیزمی عەرەبی ئەوە بریتییە لەسێ بەش:ڕایەکیان کەدەڵێ سەر هەڵدانی بیرێکی ئافرەتگەری عەرەبی مەحاڵە چونکە ڕۆشنبیری کۆمەڵگای عەرەبی ئافرەت دەچەوسێنێتەوە،ڕایەکی تردەڵێ دیاردەیەکی عەرەبی تاك و جیایە،

ڕایەکی تریش کەهەڵگرانی پێیان وایە فێمینیزمی عەرەبی دیاردەیەکی ناوچەیی فێمینیزمی جیهانییە.ماوەی نێوان ١٨٦٠تاسەرەتای ١٩٢٠سەرهەڵدانی ئەوەی بەخۆوە بینی کەپێی دەگوترێت فێمینیزمی نادیار چەند دەلیل و دەربڕینێك دەرکەوتن ئاماژەیان لەنووسینی ئافرەتانی چینی ناوەڕاست و بالاْ ئاماژەیان بەمە دەدا وەك ئەو نووسینانەی کەلەناو ئافرەتاندا دەستاو دەستیاندەکرد هەروەها لەوگۆڤارانەیشدا کەبایەخیان بەکاروبارو کێشەی ئافرەت دەدا وەك گۆڤاری (الفتح ١٨٨٢ )و(انیس الجلیس ١٨٩٢ )و (فتاەالشرق ١٩٠٦) ماوەی دووەمیش لەکۆتایی بیستەکانەوە تاکۆتایی شەستەکان سەرهەڵدانی بزوتنەوەیەکی مێگەری بەخۆیەوە بینی .لەمیسر لەبیستەکانەوە تاناوەڕاستی پەنجاکان بزوتنەوەی مێینەی چالاك دەرکەوت، لە لوبنان و سوریاو عێراق لەسییەکانەوە تاچلەکان، لەسودانیش لەپەنجاکاندا دەرکەوت.حکومەتی

دەوڵەتە عەرەبییەکان لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٠ وە تاشەستەکانیش، لەگەڵ بزوتنەوە مێینە خوازە بێلایەنەکاندا کاروباری خۆیان دەگوزەراند، جڵەوی دەگرتن، بەلاَم سەربەخۆیی لەناو نەئەبردن و هەوڵی لەناوبردنی ئەندامەکانی نەئەدان.

بۆغەرەزو ئامانجی خۆیشیان حکومەتی عەرەب بەرنامەی تایبەتی خۆیان لەمەڕ ئافرەت و چۆنێتی پێشکەوتنی دارشت.ماوەی سێیەمیش، واتە لەسەرەتای حەفتاکانەوە تائێستا، سەرلەنوێ بوژانەوەی دەربڕینی ئافرەتانەی لەمیسرو لوبنان سوریاو عێراق بە خۆیەوە بینی،هەر لەم ماوەیەدا چەند دەوڵەتێکی عەرەبی تر یەکەم شەپۆلی فێمینیزمیان بەخۆیانەوە بینی. فێمینیزمی نوێی عەرەب خەریکە هەرلەبیری گشتی یەکسانییەوە دەستپێبکات ولەویشا کۆتایی پێبێت لەبەر ئەمە دەست نیشانکردنی ڕەوتگەلی ڕوون بۆفێمینیزمی عەرەبی بەشێوەیەك یەکسانبن بەو رەوت و ئاراستە فیکری و شیتەڵکەرە ئەکادیمیانەی فێمینیزم لەڕۆژئاوادا کارێکی زۆرقوسە.لەگەڵ ئەمەیشدا دەتوانرێ بوترێت تەرحی فێمینیزمی عەرەب ڕووخساری گشتی هەریەك لەرەوتی فێمینیزمی لیبراڵی رادیکاڵی وشۆسیالیزمی و مارکسی وەردەگرێت. رەتەکانی فێمینیزمی عەرەبی خۆیان داوە لەکێشەگەلێکی وەك چینایەتی و پەتریارکی و یەکسانی ماف و هەل.زۆریشیان گفتو گۆیان لەسەربەهاو نەریتی ڕۆشنبیری و ئاینی کردووە کە پەیوەستن





بەئافرەتەوە وەك چەمکی عەورەت و حیجاب و فرە ژن هێنان ( BADRAN ٨ M.COOKE ١٩٩٥) ٢٩ بۆئەوە دەچن گوتاری فێمینیزمی عەرەب چەند بابەتێکی جیهانی هاوبەشی وەرگرتووە، وەك فێرکردن،کار، ئەومافانەی پەیوەندیان بەژنهێناوە هەیە، مافی دەنگدان لەهەمان کاتدا بابەتگەلێکی تری وەك دەرچوون لەبازنەی جیابوونەوەی جنسی و لەسەر شێوازی ئافرەت لەجیهانی سێیەمدا،بەپێچەوانەی ئافرەتی ئەورووپییەوە ،ئافرەتی عەرەب پێویست بوولەسەری بەشێوەیەکی باو ڕێگای دەربڕینی خۆی لەنێو کۆمەڵگای کشتوکاڵی دەشتەکیدا،کە تازە بەرەو شار پەرەی دەسەند بڕێت،هەروەها لەنێوکۆمەڵگاگەلێکدا هێشتا ڕۆشنبیری بۆماوەو پاشماوە ڕێکخەری گرنگی ژیانی ڕۆژانە و سەرچاوەی یەکەمی شوناسە. کێشەی فێمینیزمە عەرەبەکان لەسەر ئاستی فیکری لە پەیوەندی بەستنی بەهێزدا لەنێوان ئیسلام و باری ئافرەت لەکۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا، ئەم خاڵەیش فێمینیزمی ڕۆژئاوا جەختی لەسەردەکات.ئەم پەیوەندی بەستنە بەزۆری لەلایەن فێمینیبزمی عەرەبییەوە ڕەتدەکرێتەوە بەو پێیەی کە کۆمەڵی ئیسلامی بەرهەمی مێژووەو هەروەها بەوپێیەی کە زۆر لەکاری چەوسێنەر دژ بەئافرەت پشتیان بەدەقی ئاینی نەبەستووە.بەلاَم کێشەی فێمینیزمی عەرەب لەسەر ئاستی مەنهەجی،لە بابەتگەلێکدا پەنهانە کە دەچنە بازنەی تەرحی ئافرەتانەوە،ئەمانەیش بابەتگەلێکن خاوەن تایبەتمەندی

،هەروەها بەشێوەیەکی ڕۆشنبیری پۆلێندەکرێن. بابەتگەلێکی چەشنی تووندوتیژی، دەستدرێژی جنسی، پەیوەندی ناوخێزان، چەمکی وەك پاکی و شەرەف، ئەمانە بابەتگەلێکن فێمینیزمی عەرەب ناتوانێت تاوتوێیان بکات و گفتوگۆیان لەسەربکات بێ ملدان بۆخۆپارێزی لە کۆمەڵێ لێکۆڵینەوەی عەرەب و زمانی عەرەبی. چالاکی فێمینیزمی عەرەب تەنها دەست بەستراوی کارێکی کۆمەڵی هۆشیارو ڕێکخراو دەمێنێتەوە.





## فێمینیزم: فیکرو ڕەوتەکانی

## نورة فرج المساعد

ئەم نوسینە بەرهەمی نورە فرج ئەلمساعیدە کە دکتۆرای لە بواری زانستی کۆمەڵایەتیدا لە بەریتانیا هێناوە، ئێستاش لە زانکۆی (الملك عبد العزيز) لە جدە وانە دەڵێتەوە.

نورە، لەم نوسینەدا بە ئاگاییەوە باسی فێمینیزمو ڕەوتەکانی دەکات لەسەر کۆمەڵێك بیروڕای جیاواز دەدوێ. چاکەی کارەکەی لە روویەکی ترەوە لەوەدایە کە باسی فێمێنیزمی جیهانی سێیەمو عەرەب دەکات، من بۆ خۆم لە هەندێك شوێندا "فێمێنیزم"م بەکاربردووە. لە هەندێك شوێنی تردا لە بەرامبەر ئەم زاراوەیەدا "ئافرەتگەری"م بەکار بردووە، لە چەند جێگایەکی تردا کردوومە بە "مێیینەگەری" و "مێیینیزم".

**وەرگێڕ**

**سەرچاوە**


١) Tong R (١٩٩٢) Feminist Through. London: Roeotledge . p.٣٦

٢) Foreman A (١٩٧٧) Feminist as Alienation: Women and the Family in Marxism and Psychoses. London: photo press. P.٦٥

٣) Benston M. (١٩٦٧) The political Economy of Women's Liberation. Monthly Review, Vol.٢١ No. ٤ p.١٦

٤) Tong R. Ibut p.٧١

٥) Fireston S. (١٩٧٠) The Diaketic of Sex. New York: Bantam Books. Pp ١لج٢

٦) Oakley A. (١٩٧٤) Women's Work: The Houses wife, Past and Present. New York: Pantheo Books. P. ١٨٦

٧) K. Millett (١٩٧٠) Sexual Politic. New York: Doubleday. P.١٧٨

٨) M. French (١٩٨٥) Beyond Power: On Women, Men and Morals. New York: William Morrow. P.٧٢

٩) **فێمێنیزمی– شیکردنەوەی دەروونی وا دەبینێ چەوساندنەوەی ئـافرەت چـووەتە رۆحیـەوە ئەمـەش بـەهۆی قۆنـاغی پـێش ئۆدیبییەوە.**







١٠) Williams, J. (١٩٧٧) Psychology of Wmen. New York: W.W. Norton p.٢٧

١١) Bergmann, B (١٩٦٨) The Economic Emergence of Women. New York: Basic Books. P.٢٦٧

١٢) Mitchell J. (١٩٧١) Women's Estate. New York: Pantheon Books. Pp.١٠٠لج٠١

١٣) Hartmann H. (١٩٨١) "The Unhappy Marriage of Marxism and feminism" Towards a More Progressive Union" In Lydia Sargent, ed. A Discussion of the Unhappy Unhappy Marriage of Marxism and feminism. Boston: South End press. P.٦

١٤) Jaggar A. (١٩٨٣) Feminist politics and Human Nature. Totowa, N.J: Rowman & Al-lanheld. P.٣٥٣

١٥) Jaggar Ibid p.٣٠٠

١٦) Jaggar Ibid p.٣٠٦

١٧) de Beauvoir S. (١٩٨٨) The Second Sex. Translated & Ed. By H.M. Parshley. London: Pan Bookd Lid p. ٢٤

١٨) Ibid. p.٤١

١٩) Ibid. p.٥٥

٢٠) Ibid. pp. ٨٩-٩٠

٢١) Elshtain J. (١٩٨١) Public Man, Private Woman. New York: Princeton University Press. P.٣٠٦

٢٢) Tong. Ibid. p.٢٢٣

٢٣) Ibid. p.٢٣٢

٢٤) Johnson-odim, C. (١٩٩١) Common Themes, Different Contexts. In Third Word Women and Women and politics. Chandra T. Mohanty. Ed. U.S.A. Indiana University Press. P.٣١٦

٢٥) Leacock, E. (١٩٧٧) Reflections on the Conference on Women and Development: III. Signes ٣, no. ١ pp. ٣٢٠-٣٢٢
٢٦) Lazreg, M. (١٩٨٨) "Feminism and Difference: The perils of Writing as a Woman on Women in Algeria". Feminist Studies. Vol. ١٤. no.١. pp. ٨١-١٠٧
٢٧) Badran, M. and cooke. M. (١٩٩٠) Introduction in Opening the Gates: a century of Arab Feminist Writing. M. Badran & M. cooke eds. U.S.A. Indiana University Press. P.١٧
٢٨) Badran, M. and cooke. M. (١٩٩٠) Ibid. p.٣٣
٢٩) Majid, A. (١٩٩٨) "The Politics of Feminist in Islam". Signs. Vol.٢٣. no.٢. pp. ٣٢١-٣٦١





**لە چاپکراوەکانی پرۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم**

| ناوی کتێب | نوسینی | وەرگێڕانی |
|---|---|---|
| ١- فریوو خۆحەشاردان | عەتا محەمەد | |
| ٢- ئایین (هزر سیاسەت) | چەند نوسەرێك | یاسین عومەر |
| ٣-بەیەکداکێشانی شارستانێتییەکان | ساموێل هانتینگتۆن | ئاوات ئەحمەد |
| ٤- سوەیلا | شارام قەوامی | |
| ٥-رۆژی هاتنەکەی عودەی | ئاوات عەبدوڵڵا | |
| ٦-سیماکانی عەقلانیەت و | فالح عەبدولجەبار | ئاوات ئەحمەد |
| ٧- وەنەوشەکەی چوارشەممان | | شیرین.ك |
| ٨- نەبەهەشت لەسەر زەویدایە و | | ئومێد عوسمان |
| ٩-فیمینیزم | نورة فرج المساعد | عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی |

**نرخی (١٥٠٠) دینارە**